# بەڵگە لە کەلامی حەق
## لەسەر
# حەرامی عەرەق



نوسینی
مەڕوان کوردی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# پێشـەکـی

**الحمدُللهِ الَّذِي بيَدِهِ المُلْكُ والأَمْر ، المُبَيِّنِ فِي كِتَابِهِ العَظِيْمِ حُرْمَةَ الخَمْر ، والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلَى مَنْ أَمَرَ بِإرَاقَتِهَا ولاةَ الأَمْر ، نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ الكَاسِرِ الخَبَائِثَ بِالهَمْر ، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ المُجْتَمِعِيْنَ عَلَى السُّنَةِ بِالشَّمْر ، وَمَنْ تَبِعَهُم بإحْسانٍ فِي الفِتَنِ كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْر ، أَمَّا بَعْدُ :**

**لـە کاتێکدا ئاسمانی زانست تارمایی گرتی  بە هۆی نەمانی زاناکانەوە و یاریکردن بە بەبەڵگەکان حورمەتی دەقەکان هاتە کایەوە بە هۆی مەرامە نەگریسەکانەوە و بۆ چەسپاندنی بیرووباوەڕە لارِێ و چەوتەکان، ئەوکات خەڵکانێك دەرئەکەون و قسە ئەکەن و جلەوی زانست و مەعریفە ئەگرنە دەست و جل و پۆشاکی خوێنەواران و زانستخوازان ئەپۆشن و سیمای تار و سیایان بە بانگەشەی بریقەدار و ڕەونەقدار ئەشارنەوەو باتڵ و بەڵگەی پوچی خۆیان بە ئاوی سەراب ئاو ئەدەن و ئەیانەوێ گەشەش بکاو بەرهەمی هەبێت، جا بۆیان ناچێتە سەرو ناتوانن بەردەوامی بەخۆیانەوە ببینن و زۆر درێژە بەم گەمە مەترسیدار بدەن چونکە هیچ پەیوەندیەك نایانبەستێتەوە بە زانست و مەعریفەوە و ئەهلیەتی قسەکردنیان نیە لـەمە{ ئەم بابەتە گەورەو گرانانە ، وە دیارترین نیشانەشیان ئەوەیە:**

**لـە هەموو شتێك ئەدوێن بەبێ زانست ، وە بە هەموو قورسایی و خواری وخێچی و بەرزی و نزمی و تەنگەژەیەکدا دێن و ئەڕۆن و ئەیانەوێ بگەن بە مەرامی خۆیان و گوێ و چاوی خوێنەر وابەستەی خۆیان بکەن .**

بەلاّم ئەفسوس بێ خەبەرن لەوەی ئەم ڕێگایانە زۆر ئابڕوو بەرن و زۆر کەسیان شەرمەزار کردوەو لێبووردن نانوێنن بۆ هیچ کەسێك که پسپۆڕ نەبێ و خۆی لێ بدات ، وە پەردە لە سەر زۆر کەس هەڵمراڵراوە و گەڕاوەتەوە جا بە هۆی پەشیمان بوونەوەی و گەڕانەوەی بۆ حەق بێت یاخود لە شەرمەزاریا ، بەلاّم لەولاشەوە خەڵکانێکی تر هەن دوای چەندین جار ئابڕوو چوون و پەردەلاچوون لەسەر چەواشەکاریەکانیان هەر بەردەوام بوون !!

جا خۆشبەختی بۆ ئەوکەسەی کە خۆی یەکلا ئەکاتەوە بۆ حەق و لە هەر شتێك کە ئەیڵێت ، مەبەستی ئاشکرابوونی حەقە بەبێ دەمارگیری .

جا هەر لەم ئاسۆیەوە پێمان خۆشبوو لە بابەتێك بدوێین کە سەردەمانێکە قسەی لێوە ئەکرێت و لەبارەیەوە گوزارشت ئەکرێت ، ئەویش بابەتی (حەڕام بوون یاخوود نەبوونی عارەق)ە ، وە ئەوەشی لەم مەیدانەدا خەریکی تاودانی ئەسپی خۆیەتی و ئەیەوێت ڕأستیەکان بشێوێنێت بەوەی کە بڵێ: لە قوڕئاندا هیچ ئایەتێك نیە "عارەق" یاخود "مەی" حەڕام بکات ، جا ئەویش دوو گرووپە:

- ڕۆژهەلاّتناسەکان لە جوولەکە و خاچ پەرستان .
- کەسە بێ دین و ئەتایستەکان کە ڕەفزی ئاینەکان ئەکەنەوە .

ئەم دوو کۆمەڵە بەشێوەیەکی سەرەکی و شان بەشانی ئەوانیش ئەمڕۆ هەندێك بەناو مسوڵمان کە خۆیان پاڵ ئەدەنە پاڵ قوڕئان ، وە سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویست(صلی الله علیه وسلم) ڕەفز ئەکەنەوە و هیچ بەهاو ڕێزێك بۆ زانایانی پێشوو دانانێن و ئەوپەڕی بێ ڕێزیان بەرامبەر ئەکەن .

وه کو لای هەموان ئاشکرایە کە فەرموودەگەلێکمان هەیە لەبارەی حەڕام بوونی عارەق و لەعنەت کردن لەوەی کە مامەڵەی پێوە ئەکات  بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان ، هەر ئەمە کافیە و بەسە بۆ کەسێك کە قەدری پێغەمبەر خوای (صلی اللە علیە وسلم) لەدڵابێت  ، بەڵام وەکو بەرگریەك لە قورئان و هاتنە مەیدان بە هەمان بەڵگەی کە ئەوان پێی هاتوونەتە مەیدانەوە  کە ئەویش قورئانە ، ئێمەش بڕیارماندا بە هەمان جۆر لە بەڵگە وەڵامیان بدەینەوە و تەنها بە قورئان وەڵامیان بدەینەوەو بیسەلمێنین کە لە قورئاندا "مەی" حەڕامکراوە بەو پەڕی حەڕامکردن ، بەڵام ئەم نهێنیە کەسێك هەستی پێ ئەکاو لێی شاراوە نابێت ، کە ئاگاداری ڕێساکانی زمانی عەرەبی بێت  ، وە چوبێتە قوڵایی بنەماکانی زمانی عەرەبی کە زمانی قورئانی پیرۆزە جا بۆیە ئەبینین زۆربەی ئەم تەفسیرە هەڵانە دەرەنجامی نەزانیە بە یاساکانی زمانی عەرەبی و لەخەڵکانێکەوە دێتە وجود کە هیچ پەیوەندی و ئاشنایەتیەکی دوور و نزیك نیە لە نێوان ئەو و زمانی عەرەبی ، وە ئەم خاڵەش وای کردووە نووسین و ڕاو بۆچونیان زۆر لاوازو بێ هێزبێت و لە بەرامبەر شنەبایەکی بەڵگەو تەحقیق خۆی نەگرێت ، وە حەقیقەتی ئەم وتانەش لەناوەڕۆکی بابەتەکەدا ئەبینن بەویستی خوای گەورە و تەواو دڵنیا ئەبن کە ئەوان لەکوێوە تێ کەوتوون و بە چی شێوەیەك ئێوە ئەتوانن خاڵی لاوازی ئەوان بەدەست بێنن و گومانەکانیان پوچەڵ بکەنەوەو لە دادگای بورهان و حجە دادگاییان بکەن و بە یاسای سنووری زانست کێشان و دەرچوون لە ڕێسای نووسینی زانستی حوکمی پووچی و بێ بنەمایی بەڵگەکانیان بدەن.

وە لەخوای گەورە ئەپاڕێمەوە  کە نیازمان تیایدا تەنها زاتی پاکی خۆیبێت و ببێتە بەڵگە بەدەستی مسوڵمانی پاکی سونیەوە و ئەم نووسینەمان بکاتە توێشووی ڕۆژی

**قیامەت و لە سەختی و ناڕەحەتیەکانی ئەو ڕۆژە پشتیوانمانبێت ، وە لە دیداری ڕووی پاکی خۆی و پێغەمبەری خۆشەویستمان مەحرووم نەکات .**

وَ آخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُللهِ رَبِّ العَالَمِيْنَ

وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِيْنَ .

**مەروان کوردی**

**مەجید بەگ – سلێمانی**

**١٢ی ڕەبیعی یەکەمی ١٤٣٧ ی هیجری**

**٢٠١٥/١٢/٢٣ ی زاینی /کاتژمێر (١)ی شەو**

## پێناسەی (الخَمْر) لە زمانەوانی و شەرعدا

وشەی (الخَمْر) لـە زمانەوانیدا:

شاراوە نیە کە زانینی واتای هەر وشەیەك لـە زمانەوانیدا کاردانەوەی ڕاستەوخۆی هەیە لـەسەر تێگەیشتن پەی پێبردنی ، هەر وەکو ڕێسایەکی جێگیرە لـە زانستی لۆژیك (المَنْطِق)دا و وتراوە: " الحُكْمُ عَلَى الشَّيْءِ فَرْعٌ عَنْ تَصَوُّرِهِ "(1).

واتە: حوکمدان لـەسەر شتێك بەشێکە لـە تصورکردن و تێگەیشتن لـێی .

جا بۆیە ئەلـێین شتێکی جێی باوەڕ نیە تێگەیشتن لـە شتێك بەبێ زانینی مانا زمانەوانیەکەی ، وە ئەگەر هات و نەمانتوانی وەك خۆی لـە شتەکە بگەین ئەوا پێناسە و حوکمەکەشمان بەسەریدا هەڵـەیەو جێی متمانە نیە لـە میزانی زانست و ماریفەتدا ، ئێستاش کاتی ئەوەیە لـە زمانەوانیدا تیشك بخەینە سەر بابەتی خوازراو .

ئەگەر بێت و چاوێك بگێڕین بە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا ئەوا ئەبینین وشەی (الخَمْر) ، بە کۆمەڵـێك شێوە لـێك دراوەتەوە و باسی ئەوەیان کردووە کە بۆچی "مەی" ناونراوە (الخَمْر) ، لـەوانە:

(وَالْخَمْرُ: مَعْرُوفَةٌ وَيُقَالُ: سُمِّيَتْ خَمْرًا لِأَنَّهَا تُخَامِرُ الْعَقْلَ . زَعَمُوا ، أَيْ: تُخَالِطُهُ وَتُدَاخِلُهُ)(1).

---

(1) – شرح الكوكب المنير لابن نجار الحنبلي ١/٥٠ ، ت: محمد الزحيلي ونزيه حماد ، مكتبة العبيكان ، ط: الثانية ١٤١٨هـ . و غمز العيون البصائر لأبي العباس الحموي الحنفي٢/٣١٤ ، دار الكتب العلمية ، ط: الأولى، ١٤٠٥هـ

واته: مەی شتێکی ناسراوە و ئەوترێت: بۆیە پێی وتراوە خەمر چونکە (تُخَامِرُ الْعَقْلَ)، وا گومانیان بردووە چونکە تێکەڵی عەقڵ ئەبێت و ئەچێتە ناویەوە.

وە هەر لـە مەڕ پێناسەی زمانەوانی بۆ وشەی (الخَمْر) پێشەوا (ابْنُ الأنباريّ) ئەفەرموێت سێ وتە هەیە لـەم بارەیەوە :

إِحْدَاهُنَّ: لِأَنَّهَا تُخَامِرُ الْعَقْلَ . أَيْ: تُخَالِطُهُ .

وَالقَوْلُ الثَّانِي: لأنَّهَا تُخَمِّرُ العَقْلَ، أَيْ: تَسْتُرُهُ.

وَالقَوْلُ الثَّالِثُ: لأنَّهَا تُخَمِّرُ. أَيْ: تُغَطِّي)[2].

واتە:

وتەی یەکەمیان: لـەبەر ئەوەی (تُخَامِرُ الْعَقْلَ). واتە: تێکەڵی عەقڵ و ژیری ئەبێت(یانی تێکەڵی عەقڵ ئەبێت و تێکی ئەدات و نایەڵێت سەلامەت بێت).
وتەی دووەم: لـەبەر ئەوەی (تُخَمِّرُ العَقْلَ). واتە: ژیری دائەپۆشێت ئەپۆشێت.
وتەی سێیەم: لـەبەر ئەوەی (تُخَمِّرُ). واتە عەقڵ و ژیری ئەشارێتەوە.

---

[1] – جمهرة اللغة لابن دريد١/٥٩١ ، ت: رمزي منير بعلبكي ، الناشر: دار العلم للملايين – بيروت ، ط: الأولى، ١٩٨٧م. و الصحاح للجوهري ٢/٦٤٩ ، ت: أحمد عبد الغفور عطار ، دار العلم للملايين – بيروت– ط: الرابعة ١٤٠٧ هـ

[2]– الزاهر لابن الأنباري ١/٤٣٥ ، ت: د. حاتم صالح الضامن ، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت ، ط: الأولى، ١٤١٢ هـ. وتهذيب اللغة للأزهري ٧/١٦٠ ، ت: محمد عوض مرعب ، دار إحياء التراث العربي – بيروت– ط: الأولى، ٢٠٠١م ، معجم مقاييس اللغة للأزهري ٢/٢١٥ ، ت: عبد السلام محمد هارون ، الناشر: دار الفكر ، ١٣٩٩هـ.

**وه هەروەها لای زانایانی شەرعزان چەندین پێناسەی بۆ کراوه بەڵام ئەوەی زۆرینەی زانایان لـەسەری کۆکن ئەکریَ بەم شێوەیەی خوارەوه دایبڕێژینەوه و بڵێین:**

**((وَهِيَ كُلُّ مَا أَسْكَرَ سَوَاءٌ اتُّخِذَ مِنْ الْعِنَبِ أَوِ التَّمْرِ أَوِ أَوِ الشَّعِيرِ أَوْ غَيْرِهَا سَواءً طُبِخَ أَوْ لَمْ يُطْبَخْ))[1].**

**هەرشتێکه که سەرخۆش بکات جا ئەگەر بێت و لـه تریَ وەچنگ هاتبێت یاخود خورما یان جۆ یان غەیری ئەمانیش وه کولێنرابێت یاخود نەکولێنرابێت.**

**کەواته هەر شتێك سەرخۆشکەر بێت و هۆش خامۆش بکات ئەوه پێی ئەوترێت مەی جا لـه هەر شتێك درووستکرابێت و شلـەمەنی بێت یاخود نا وه کولێنرابێت یاخود به پێچەوانەوه ئەوا بریتیه لـه مەی و هەمان حوکمی هەیه که باسی ئەکەین به ویستی خوای گەوره .**

[1]- المدوَّنة للإمام مالك ٥٢٣/٤ ، الناشر: دار الكتب العلمية،الطبعة: الأولى، ١٤١٥هـ. البيان والتحصيل لابن رشد ١٨٩/٣و٢٨٠/١٦ ت: د.محمد حجي وآخرون، الناشر: دار الغرب الإسلامي، بيروت – لبنان- ، الطبعة: الثانية، ١٤٠٨ هـ. والذخيرة للقرافي ١١٣/٤ ، دار الغرب الإسلامي- بيروت - الطبعة: الأولى، ١٩٩٤ م. البيان للعمراني ٥١٩/١٢ ،ت: قاسم محمد النوري،الناشر: دار المنهاج – جدة- ،الطبعة: الأولى، ١٤٢١ هـ. المجموع شرح المهذَّب للنووي ١١٢/٢٠ ، دار الفكر بيروت –لبنان- . والشرح الكبير لابن قدامة ٣٢٨/١٠ ، دار الكتاب العربي للنشر والتوزيع ، أشرف على طباعته: محمد رشيد رضا. المحلَّى لابن حزم ١٧٦/٦ ، دار الفكر –لبنان-

## ناوەكانی( الخَمْر ) لە زمانی عەرەبیدا

زمانی عەرەبی دەوڵەمەندترین زمانە لە ڕووی وشەوەو خاوەنی گەورەترین فەرهەنگی واتاو ئاخاوتنە، جا بۆیە ئەو شتانەی کە دیارن زۆربەی کات لە ناوێك زیاتریان هەیەو ، هەندێکیان ئەچێتە سەرووی﴿۱۰۰﴾ ناو و کەمتر لەو ڕێژەیەو زیاتر لەوەش هەن ئەگەر بچینەوە کتێبەکانی زمان و فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی ، وەیەکێك لەو شتانەش کە گەلێك ناوی هەیە بریتیە لە مەی ، کە ئەمانەی خوارەوە هەندێك لەناوەکانیەتی:

(الرَّحيقُ ، الخَمْرُ ، الزَّقُ ، الشَّمُولُ ، المَشْمُولَةُ ، الخَنْدَرِيسُ ، الحُمَيَّا ، العُقَارُ ، القَرْقَفُ ، الخُرْطُومُ ، الرَّاحُ ،المُدَامَةُ ، القَهْوَةُ ، السَّلاَفُ ، الطِّلاَءُ ، الكُمَيْتُ الحَمْرَاءُ ، الصَّهْبَاءُ ، البَاذِقُ ، الإصفند ، الفَيْهَجُ ، القِنْدِيد ...)[1].

ناوەکانی زۆر لەمەی کە هێناومانە زیاترە بەڵام تەنها ویستمان وەکو بەرچاو ڕوونیەك هەندێکی نەقڵ بکەین ،چونکە پێش باسکردنی حوکمی هەر شتێك زانینی ناوەکانی و جۆرەکانی گرنگیەکی ئەوتۆی هەیەو نابێت پشتگوێ بخرێت ، وە زانای زمانناس پێشەوا (الثَّعَالِبيّ) ئەفەرموێت: ناوی کۆو گشتگیر بریتیە لە (الخَمْرُ) وە ئەوانەی تر کە هاتوون وەکو سیفەتن یاخود شێواز و چۆنیەتیکەی[2].

---

[1] - فقه اللغة للثعالبي ، ص:١٨٦ ، ت:عبد الرزاق المهدي ، الناشر: إحياء التراث العربي ، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤٢٢هـ. والجراثيم لابن قتيبة ١٠٧/٢ ، محمد جاسم الحميدي ، قدم له: الدكتور مسعود بوبو ، الناشر: وزارة الثقافة، دمشق. والعين للخليل ١٤٥/٣ ، والزاهر في معاني كلمات الناس لابن الأنباري ٢٤/٢ ، ت: د. حاتم صالح الضامن ، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت– ، الطبعة: الأولى، ١٤١٢ هـ. وتهذيب اللغة للأزهري ٣١٩/٩

[2] - فقه اللغة للثعالبي ، ص:١٨٦

بەڵێ هەر وەکو ئەم زانا بەڕێزە ئەفەرموێت ئەو ناوانەی تر هەموویان یاخود وەك سیفەتێك و خەسڵەتێك هاتوون یاخود جۆرێکی تایبەتە لە مەی و باس کراوە ، بۆ نمونە (الطِّلاَءُ) بریتیە لەو مەیەی کە شلە مەنیەو ئەکولێنرێت ، وە ئەوانی تریش بە هەمان شێوە هەر یەکەو تایبەتمەندی خۆی هەیە.

## ئەو ئایەتانەی کە باس لە ( مەی ) ئەکەن

دیارە کە مەی بە چەند قۆناغێك خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوەو حەرامی کرد ، وە ئەمەش بەزەیی خوای گەورەو گەورەیی و حیکمەتی شەریعەتی ئیسلام بە دیار دەخات لەکاتێکدا کە خەڵکی وابەستەی مەی بوون و لەتوانای هەموویاندا نیە کە بەیەکجاری وازی لێ بێنن ، جا بۆیە خوای گەورە لەناردنی شەریعەت و پەیامەکانیدا بە دانایی و کارزانی خۆی مەوداو سنورێکی بۆ هێشتووونەتەوەو بەزەیی و سۆزی خۆی زیاتر نیشانداون ، هەر بۆیە لە ئایەتی یەکەمدا ئەفەرموێت:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ ﴿٢١٩﴾ ﴾ البقرة: ٢١٩

واتە:

ئەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پرسیاری مەی و قومارت لێ ئەکەن ، تۆش پێیان بڵێ: تاوان(زەرەرو زیان)ێکی زۆر گەورەیان تێدایە و هەندێك سوودیشیان هەیە ، بەڵام زەرەر و زیانیان زیاترە تاوەکو سوود و قازانجیان.

پاشان دوای ئەم ئایەتە کە باسی خراپەو تاوان و زیانی مەی کرد خوای گەورە ئایەتێکی تری نازل کرد بۆ ئەوەی زیاتر کارەکەیان لە پێش چاو بکەوێت و قێزەونی بکات ، وە فەرمووی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النساء: ٤٣

واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە نزیکی نوێژ مەکەونەوە لەکاتێکدا کە سەرخۆشن تاوەکو ئەو کاتەی کە ئەزانن چی ئەڵێن(واتە تاوەکو ئەوکاتەی کە دێنەوە هۆشی خۆتان).

جا بەم دوو ئایەتە زۆرێك لـە هاوەڵان(خوایان لـیٚ ڕازیبێت) وازیان لـە مەی خواردنەوە هێنا و زۆرێکی تریشیان هەبوو کە هەر مەیان نەدەخواردەوە چونکە ئەیانوت لـە پیاوەتی مرۆڤ کەم دەکاتەوە.
دوای ئەم دوو قۆناغەی پێشوو کە وەکو سەرتاو دەستپێکی حوکمەکە وابوو خوای گەورە ئایەتی سێیەمی نارده خوارەوەو بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکرایی حوکمی مەی خواردنەوەی بەیانکرد و فەرمووی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾ المائدة: ٩٠

واتە:

ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە بە دڵنیاییەوە مەی و قومار و ئەو بەردانەی کە سەربڕینی لـەسەر ئەکرێت بۆ بت و ئەو پارچە دارانەشی کە وەکو یانسیب بەکاری دێنن پیسن و لـە کردەوەی شەیتانەکانە بۆیە خۆتانی لـیٚ بپارێزن بۆ ئەوەی سەرفرازبن.

جا ئەگەر بڕوانینە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوپەڕی حەرامکردن بەکارهاتوەو ئەبینین بەشێوەیەك مەی حەڕام و یاساغ کراوە کە جێگای هیچ وتەیەکی تر نابێتەوە، بەڵام کەسێك پەی بەو ڕاستیە ئەبات کە شتێکی لـە ڕەوانبێژی عەرەبی(البَلاَغَة) خوێندبێت و بیزانێت ، بۆ نمونە خوای گەورە چەندین دەستەواژەی لـەو ئایتە پیرۆزە بەکارهێناوەو بە سیاغێك نازڵی کردووە کە

پێویستی به خوێندنەوەیەکی وردە تاوەکو مافی خۆی پێ بدەیت ، وە لەو دەستەواژانە[1]:

١. ڕستەکە بە وشەی(إِنَّمَا)،دەستی پێکردووە کە بۆ دووپاتکردنەوەو دڵنیاکردنەوەیە و ئەو حوکمەی کە باسی ئەکەی کورتی ئەکەیتەوە لەو ڕستەیەدا بە تەنها ، وەك ئەوەی بڵێی: هیچ شتێکی پیس نیە هێندەی مەی و ... پیس بێت ، یان بڵێی مەی و ئەوانەی تریش کە باسکراون لە پیسی زیاتر شتێکی تر نین .

٢. لکاندنی مەی بە بتپەرستیەوە کە ئەمەش خۆی بۆ خۆی زیاتر وای لێ ئەکات کە قێزەونتر ببێت و مرۆڤی مسوڵمان خۆی لێ بەدوور بگرێت و بە حەڕامی بزانێت چونکە هیچ شتێکی حەڕأم نیە کە لەلای مسوڵمان ناشرینتر و نابوت تربێت لە پەرستنی غەیری خوای گەورە ، جا لێرەدا کە مەی لەگەڵ ئەو تاوانە قێزەونە ناوی هاتووە هەر وا بەبێ هودە نیە .

٣. خوای گەورە پاڵی داوەتە پاڵ شەیتان و ئەفەرموێت لە کارو کردەوەی شەیتانە ، وە زانراویشە شەیتانەکان کاروکردەوەکانیان بەتەنها شەڕەو کارێکیان نیە کە بەتەواوی خراپ نەبێت ، وە هەرگیز شەیتان باس ناکرێت و وەسف ناکرێت بەوەی کە کردەوەیەك بکات و باشبێت وە بگرە هەر کەسێکیش لە نەوەی ئادەم خراپترین کار و بەدترین کردەوە ئەنجام بدات پێی ئەوترێت شەیتان ئاسایە ، جا ئەمەش ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە مەی بەتەنها شەڕو خراپەیەو ئەم هۆکارەش بەسە بۆ ئەوەی کە حەڕام بێت.

---

[1] - زانای موفەسیر (زەمەخشەری) هەندێك لەمانەی بەجوانی باس کردووە لە تەفسیرەکەی.١/٦٧٥ ، الناشر: دار الكتاب العربي – بيروت– ، الطبعة: الثالثة – ١٤٠٧ هـ

**٤. خوای گەورە دەستەواژەی فرمانی بەکارهێناوە (فَٱجۡتَنِبُوهُ)، کە فرمانە بە وازهێنان و دوورکەوتنەوە لـە مەی و ئەو شتانەی پێشوش کە باسکران وە شتێکی زانراوە کە فرمان بۆ واجب بوونە تاوەکو بەڵگەیەك نەبێت لـە واجیی لایدات و بیکات بە سوننەت[1] ، جا بە هەمان شێوەش ئەم فرمانە کە کراوە بەو ڕەهاییە بۆ وازهێنان لـە مەی ئەوە دەردەخات کە حەڕامە ، چونکە ئەگەر بێت و حەڕام نەبوایە ئەوا بەڵگەیەك ئەهات و ئەو فرمانەی لـە حەڕام لا ئەداو ئەیکردە (مکروە).**

**٥. خوای گەورە لـەم ئایەتەدا سەرفرازی و سەرکەوتنی دونیاو قیامەتی بەستوەتەوە بە وازهێنان لـەمەیەوە وە پێچەوانەی سەرفرازیش نەگبەتی و دەردە سەری قیامەت و جەهەننەمە پەنا بەخوای گەورە ، جا ئەگەر بێت و مەی حەڕام نەبێت بۆچی ئەبێ کەسی مەی خۆر ڕەنج بەخەساربێت لـە قیامەتدا؟!**

**وە کو بینیمان ئەم ئایەتە پیرۆزە چەندین بەڵگەی حاشاهەڵنەگری لـەخۆگرتوە لـەبارەی حەڕام بوونی مەی و خوای پەروەردگار بەوپەڕی**

---

[1] - قَاعِدَةُ: (الْأَمْرُ لِلْوُجُوبِ) ، والإحكام للآمدي ١٤٨/٢ ، ت: عبد الرزاق عفيفي ، الناشر: المكتب الإسلامي، بيروت- لبنان- ، والمعتمد لأبي الحسين البصري ٥٨/١ ، ت: خليل الميس ، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت- الطبعة: الأولى، ١٤٠٣هـ, والفصول للجصاص ١٦٢/٢ ، ط: وزارة الأوقاف الكويتية ، الطبعة الثانية، ١٤١٤هـ. والمحصول للرازي ٢٨/٢ ، ت: الدكتور طه جابر فياض العلواني ، الناشر: مؤسسة الرسالة، الطبعة: الثالثة، ١٤١٨ هـ. وكشف الأسرار شرح أصول البزدوي ١١٤/١ ، دار الكتاب الإسلامي ، الطبعة: بدون طبعة وبدون تاريخ. وبيان المختصر شرح مختصر ابن الحاجب ٣٩٦/١ ، ت: محمد مظهر بقا ، الناشر: دار المدني، السعودية ، الطبعة: الأولى، ١٤٠٦هـ.

ڕوونی بەیانی حوکمەکەی کرد، وە پاشان دوای ئەم ئایەتە دیسانەوە دووپاتی حەڕام بوونی ئەکات و ئەفەرمویّت:

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ۝٩١﴾ المائدة: ٩١

واتە: شەیتان هەر ئەوەی ئەویّ کە دوژمنایەتی و ڕق و کینە بخاتە نیّوانتانەوە بەهۆی مەی و قومارەوە و بەرەنگارتان ببیّتەوە لەوەی یادی خوای گەورە نەکەن و نویّژەکانتان ئەنجام نەدەن دەسا ئیتر ئیّوە وازدیّنن؟!

ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕەچاوی ڕیّسایەکی زۆر گرنگی ڕەوانبیّژی تیاداکراوە، بەلاّم ئەفسوس ئەوانەی کە ئەمڕۆ بانگەشەی قورئان ئەکەن دوورن لە تیّگەیشتن لەو بابەتانەو لە کانیاوی دەستووری قورئان و بەیانی بەرز و سازگاریان نەنۆشیوە تاوەکو لە تینیویّتی و غەیبی نەزانی بیّنە دەرەوە، وەها تیّگەیشتوون کە ئەداتی ئیستفهامی (هل) بۆ سەرپشك کردنەو هەلّبژاردنی خستوەتە بەردەستیان لەوەی ئایا ئەوان واز دیّنن یاخود نا !!

بیّ خەبەر لەوەی کە ﴿هل﴾ تەنها بۆ ئیستفهام نیەو چەندین مانای تری هەیە لە زمانی عەرەبیدا و یەکیّك لەو مانایانەش بریتیە لە ﴿أمر﴾ فرمانکردن، وە لە کتیّبەکانی زمانەوانیدا ئەم بابەتە جیّگەی باس و خواسەو زانایانی پسپۆڕی زمان لیّی دواون بە تیّرو تەسەلی[1].

---

[1] – الإنصاف لابن الأنباري ٥٧٨/٢ ، المكتبة العصرية ، الطبعة: الأولى ١٤٢٤هـ. الجنى الداني في حروف المعاني لبدر الدين المرادي المالكي ، ص:٣٤٦ ، ت: د فخر الدين قباوة –

بێ ئەوەی بزانن و هەست بکەن کە ئەم ئایەتە چی شێوازێکی بەهێزی بەکار هێناوە لەبری دەستەواژەی حەرام بوون ، ئەویش بریتیە لە باسکردنی حوکمەکەی بەشێوەی ناڕاستەوخۆ و﴿کینایە﴾ بەڵێ کینایە!!

زانایانی ڕەوانبێژی کۆکن لەسەر ئەم بنچینەیە: ﴿الكِنايَةُ أَبْلَغُ مِنَ التَّصرِيْحِ﴾[1]. وە هەروەها پێشەوا (الأَخْضَري)یش ئەم ڕێسایەی کردووە بە شیعر و ئەفەرموێت لە نەزمەکەی کە لە زانستی بەلاغەدایە[2]:

ثُــمَّ الْمَجَــازُ وَالْكُنَــى أَبْلَــغُ مِــنْ      تَصْــرِيحٍ أوْ حَقِيقَــةٍ كَــذَا زُكِــنْ

پوختەی وتە ئەوەیە لە زمانی عەرەبیدا ﴿کنایە﴾ بەهێزتر و کاریگەرترە لە صەراحەت لەکاتی فرمان کردن بە شتێك یان ڕێگری کردن لێی، هەروەکو کەڵەزانای مەیدانی بەلاغە پێشەوا جورجانی ئەفەرموێت:

(قَدْ أَجْمَعَ الجَمِيعُ عَلَى أنَّ "الكِنايَةَ" أَبْلَغُ مِنَ الإِفْصَاحِ .. إِذَا قُلتَ: "رَأيتُ أَسَداً"، كانَ لِكَلامِكَ مَزِيَّةٌ لا تَكُوْنُ إِذا قُلتَ: رأيتُ رَجلاً هُو وَالأَسَدُ سَوَاءٌ، فِي مَعْنَى الشَّجَاعةِ وَفِي قُوَّةِ القَلْبِ وَشِدَّةِ البَطْشِ وَأَشْبَاهِ ذلِكَ. وإِذا قُلتَ:

---

الأستاذ محمد نديم فاضل ، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان– ، الطبعة: الأولى، ١٤١٣ هـ. مغني اللبيب لابن هشام ، ص:٦٢٩ ، ت: د. مازن المبارك / محمد علي حمد الله ، الناشر: دار الفكر – دمشق ، الطبعة: السادسة، ١٩٨٥. وشرح مفصل الزمخشري لابن يعيش ٢٧٥/٤ ، ت: الدكتور إميل بديع يعقوب ، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان– ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢ هـ

[1] – مفتاح العلوم للسكاكي ص: ٢٨٦ ، ضبط و تحقيق: نعيم زرزور، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان– ، الثانية، ١٤٠٧ هـ. دلائل الإعجاز للجرجاني ، ص:٧٠ ، تحقيق: محمود شاكر ، مطبعة المدني بالقاهرة – دار المدني بجدة ، الطبعة: الثالثة ١٤١٣هـ. والإتقان للسيوطي ١٥٧/٣ ، ت: محمد أبو الفضل إبراهيم، الناشر: الهيئة المصرية العامة

[2] – متن الجوهر المكنون للأخضري ، ص:٤٠ بيت٢١٠ .

"بَلَغَنِي أَنَّكَ تُقَدِّمُ رِجْلاً وتُؤَخِّرُ أُخْرَى"، كانَ أَوْقَعَ مِنْ صَرِيْحِهِ الَّذِي هُوَ قولُكَ: بَلَغَنِي أَنَّكَ تَتَرَدَّدُ فِي أَمْرِكَ)[1].

واته:

هەموان کۆبوونەتەوە (شارەزایانی زمانی عەرەبی) لەسەر ئەوەی کە کینایە بەهێزترە لە وشەی ڕاستەوخۆ و صریح ، ئەگەر هات و وتت: "شێرێکم بینی" ئەوا لە وتەکەتدا تایبەتمەندیەك هەیە کە درووست نابێت ئەگەر وتت: پیاوێکم بینی ئەو و شێر وەك یەکن ، لە واتای ئازایەتی و دڵ پتەوی و تۆڵەسەندنەوەی بە زەبر و وێنەی ئەمانە. وە ئەگەر وتت: "هەواڵم پێ گەیشتووە قاچێکت پێش دەخەیت و ئەوی تر دوا ئەخەیت" ئەوا بەهێزتر و لەجێ ترە لەوەی کە بەصریحی بڵێیت: هەواڵم پێ گەیشتووە کە تۆ دوودڵ و تیاماویت لە کارەکەت.

وە هەروەها (الجَاحِظ) بەهەمان شێوە ئەڵێت: (وَرُبَّمَا كَانَتِ الكنايةُ أَبْلَغَ فِي التَّعْظِيْمِ، وَأَدْعَى إِلَى التَّقْدِيْمِ، مِنَ الإِفْصَاحِ وَالشَّرْحِ)[2].

واته: وە زۆر جار کینایە کاریگەرترە لە بەگەورەدانان و لە پێشترە لە صەراحەت و ڕاڤەکردن.

وە هەروەها خەتیبی قەزوینی ئەفەرموێت:(أَطْبَقَ البُلغاءُ عَلَى أنَّ المَجَازَ وَالكِنَايَةَ أَبْلَغُ مِنَ الحَقِيْقَةِ والتَّصْرِيْحِ)[3].

---

[1] – دلائل الإعجاز ، ص:٧٠

[2] – الرسائل ٣٠٧/١ ، تحقيق: عبد السلام محمد هارون ، مكتبة الخانجي، القاهرة ،١٣٨٤

[3] – الخَطِيْبُ القزويني في تلخِيص المِفْتَاحِ مَعَ المطَوَّل للتفْتَازَانِي ص: ٦٤٨ ، تعليق: أحمد عناية ، دار الكوخ ، ط: الأولى ١٣٨٧

واته: ڕەوانبێژان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە مەجاز و﴿کنایە﴾ بەهێزتر و ڕەوانترن لە صەراحەت و حەقیقەت.

جا بەهەمان شێوەی ئەم نمونانەی کە ئەم زانایانە هێنایانەوە لە بارەی کنایەو وتەی صەریح وە بەهێزی کنایەو قوەتی بەسەر صەریحەوە چەندقاتە ، جا تەعبیر و گوزارشتی زانایان بە وتەی ﴿أبلغ﴾ مەبەست پێی ئەوەیە بەهێزترو مانادارترەو هەندێکیش وای لێ تێدەگەن کە ڕەوانترەو لە بەلاغەتەوە هاتووە ، وە ئەگەر بێت و بمانەوێت نمونەیەك بهێنینەوە لە مەڕ ﴿کینایە﴾ بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە ئەڵێین: (أَبِي نَظِيْفُ اليَدِ). ئەم وتەیە کەسێکی سادە هەر ئەوەندی لێ تێ ئەگات کە وتراوە: باوکم دەستی شۆردوەو ئەوەش سیفەتی بەردەوامی ئەوەو دەستی پاکە !!

بەڵام لە ڕاستیدا ڕۆحی ڕستەکە زۆر لەوە جودایە کە وەها مانایەکی پێ بدرێت، بەڵکو مەبەستی پێی ئەوەیە باوکم کەسێکی پاکە لەوەی دەست ببات بۆ ئابڕووی کەسێك یان ماڵی کەسێك یان لە کەسێك بدات بە ناحەق، یان ...

جا ئەم هەموو مانایە لە پشت ئەو ڕستەیەوە خۆی حەشار داوە کە کەسی ئاسایی هەستی پێ ناکات.

وە نمونەی ئەم ئایەتەش هەمان نمونەیە و زۆر بەهێزتر و واتادارترە لەوەی کە بوترێت:(حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الخَمْرُ) یان هەر گوتەیەك کە ڕاستەوخۆ ئاماژەی حەڕام بوونی تیادابێت چونکە بەم نمونەیە هەوڵی جوڵاندن و بزواندنی هەستیان ئەدات و بەئاگایان دێنێتەوە لەوەی کە تیایدان لە خراپەو

پەیامەکەش بۆ ئیماندارانە کە گەورەترین هەستیان هەیە بەرامبەر خوای گەورە کە بەدیهێنەری ئەوانەو ئەوانیش هەمیشە خۆیان بە قەرزداری دەزانن ، هەروەکو زانای تەفسیرزان "ئەبو حەییانی ئەندەلوسی" ئەفەرموێت:

"وَهَذَا الِاسْتِفْهَامُ مِنْ أَبْلَغِ مَا يَنْهَى عَنْهُ كَأَنَّهُ قِيلَ قَدْ تُلِيَ عَلَيْكُمْ مَا فِيهِمَا مِنَ الْمَفَاسِدِ الدُّنْيَوِيَّةِ وَالدِّينِيَّةِ الَّتِي تُوجِبُ الِانْتِهَاءَ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ أَمْ بَاقُونَ عَلَى حَالِكُمْ مَعَ عِلْمِكُمْ بِتِلْكَ الْمَفَاسِدِ. وَجَعْلُ الْجُمْلَةِ اسْمِيَّةً وَالْمُوَاجَهَةُ لَهُمْ بِأَنْتُمْ أَبْلَغُ مِنْ جَعْلِهَا فِعْلِيَّةً. وَقِيلَ هُوَ اسْتِفْهَامٌ يَضْمَنُ مَعْنَى الْأَمْرِ أَيْ فَانْتَهُوا وَلِذَلِكَ قَالَ عُمَرُ انْتَهَيْنَا يَا رَبِّ"(١).

واتە: ئەو ئیستیفهامە لە بەهێزترینی شێوەکانی نەهی کردنە هەر وەك ئەوەی وترابێت: بەڕاستی بەسەرتانا خوێنرایەوە ئەوەی کە تیایەتی لە خراپە گەلێکی دنیایی و دینی کە واجبی دەکات وازهێنان ، ئایا ئیتر ئێوە وازدێنن و کۆتایی پێ دێنن یاخود ئەمێننەوە لەسەر حاڵی خۆتان لەگەڵ بوونی زانستیشتان بەو هەمووە خراپە.

وە خوای گەورە گەورە جملەیەکی اسمی بەکارهێناوە لەگەڵ ڕووتێکردنیان بە وشەی ﴿أنتم﴾ کە بەهێزترە لە جملەی فیعلی ، وە هەروەها وتراویشە ئەوە ئیستفهامێکە مانای فرمانی تێدایە بۆیە ئیمامی عومەر(خوای لێ ڕازیبێت) فەرمووی: وازمان هێنا ئەی پەروەردگارا.

بەڕاستی لەدوای وەها ئایەتێك و وەها لۆمەیەك ئەوپەڕی شەرمەزاریە کەسێك بێت و سنووری قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە بشکێنێت و بەهەر بیانویەك دەست بباتە مەی و بیخواتەوە ، لەکاتێکدا ئەم سەرزەنشتە بەسە بۆ

---

(١) - البحر المحيط ٣٥٩/٤ ، ت: صدقي محمد جميل، الناشر: دار الفكر – بيروت– الطبعة: ١٤٢٠ هـ. وە زۆرێکی تر لە زانایان وێنەی ئەم وتانەیان نەقڵ کردووەو زۆربەیان لە زەمەخشەریان ورگرتووە

کەسێك هەست بە چاودێری خوایی بكات بەسەریەوە و خۆشی بەئیماندار ئەزانێت و بەوشێوەیە خوای گەورە باسی مەی بۆ بكات و ئەو هەر خۆی لە گێلی بدات ، وە ئایەتەكە زۆر ڕوونترە لەوەی كە خەڵكانێك بێن و بەشێوەیەكی تر لێكدانەوەی بۆ بكەن كە هەڵی نەگرێت جێگای نەبێتەوەو لەگەڵ ڕێساكانی زمانی عەرەبی یەك نەیەتەوە ، چونكە لەكاتی تەفسیردا هەرگیز نابێت بیٚ ئاگابین لەزمانی عەرەبی چونكە زمانی قورئانەو بەحرێكی بیٚ كۆتاو كەناریشە،وە لە ئەنجامی نەزانی خۆشیان دێن گاڵتە بە ڕاوبۆچوونی ڕاست دەكەن و لۆمەیان دەكەن

أَتَانَـــا أَنَّ سَـــهْلاً ذَمَّ جَهْـــلاً　　عُلُوْمًـــا لَـــيْسَ يَعْـــرِفُهُنَّ سَـــهْلُ
عُلُوْمًـــا لَـــوْ دَرَاهَـــا مَـــا قَلاهَـــا　　وَلَكِـــنَّ الرِّضَـــى بِالْجَهْـــلِ سَـــهْلُ[(١)]

بۆمـــان هـــات لۆمـــەی ســـەهل زانســـتانێك بەنـــەزانی
زانســـت گـــەلێك نەیـــدەزانی بـــەجوانی
زانســـتانێك گـــەر زانیبـــای نەیدەبوغزانـــد
بـــەڵام ســـادەو ســـاكارە ڕەزایـــەت بـــە نـــەزانی

جا بەداخەوە هەر ئەوەیە حاڵی زۆرێك لەو بەناو ڕۆشنبیرو خوێنەوارانەی ﴿سەهل﴾ ئاسا بونەتە ماڵ بەسەر قەڵەم و نووسین وزانستەوەو كە بە حیبر و مرەكەبیان مێشكی كەسانی سادە ئەگەزن و بەناوی خوێندنەوەی نویٚ بۆ نەص و تەفسیری تازەو گونجاندنی دەق لەگەڵ واقیع و چەندین ناونیشانی

---

(١) – أدب الطلب للشوكاني ، ص: ١٥٧ ، المحقق: عبد الله يحيى السريحي ، الناشر: دار ابن حزم – لبنان / بيروت ، الطبعة: الأولى، ١٤١٩هـ.

تری ڕازاوه ژەهری خۆیان ئەڕێژن و خەڵکانێکیش وائەزانن فریادڕەسیانن و دەستی هاوکاریان بۆ درێژ دەکەن .

## تێگەیشتنی ئیمامی عومەر باشترین شاهیده !!

لەدوای بینینی فەساد و خراپی مەی و ئەو دەرهاویشتەو لێکەوتە خراپەی کە ئەبینرا پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ ڕازیبێت) داوای لە خوای گەورە کرد کە لەبارەیەوە ئایەت نازڵ بکات و بۆیان ڕوون بکاتەوە بە ڕوونکردنەوەیەك کە هیچ گومان و دوو دڵیەك هەڵنەگرێت وەکو لەو بارەیەوە زانایانی فەرمووده وردەکاری چیرۆکەکەیان باسکردوەو ئەفەرموون:

عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ قَالَ عُمَرُ: «اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شَافِيًا» فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ "، فَقَالَ عُمَرُ: «اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شَافِيًا»، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي النِّسَاءِ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى} [النساء: ٤٣] فَكَانَ مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَقَامَ الصَّلَاةَ نَادَى: {لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى} [النساء: ٤٣] فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شَافِيًا»، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، فَلَمَّا بَلَغَ {فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ} [المائدة: ٩١] قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: «انْتَهَيْنَا انْتَهَيْنَا»[1].

---

[1] – صححه الشيخ أحمد شاكر والأرناؤوط: رواه أحمد في المسند ٤٤٢/١ برقم: ٣٧٨ ، ت: شعيب الأرنؤوط – عادل مرشد، وآخرون، إشراف: د عبد الله بن عبد المحسن التركي، الناشر: مؤسسة الرسالة، الطبعة: الأولى، ١٤٢١ هـ.والنسائي ٢٨٦/٨ ، برقم:٥٥٤٠ ، ت: عبد الفتاح أبو غدة ، الناشر: مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب– ، الطبعة: الثانية، ١٤٠٦.

واتە:

لە باوکی مەسیەرەوە و ئەویش لە عومەرەوە(خوای لیّ ڕازیبیّت): کاتێك کە ئایەتی حەڕامبونی مەی هاتە خوارەوە[1]، عومەر فەرمووی: "ئەی پەروەردگارا بۆمان ڕوون بکەرەوە لەبارەی مەیەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی شیفا بەخش" ئیتر ئایەتەکەی سورەتی ﴿البقره﴾ دابەزی و بانگی عومەر کراو خوێنرایەوە بەسەریدا ، دیسانەوە عومەر فەرمووی:"ئەی پەروەردگارا بۆمان ڕوون بکەرەوە لەبارەی مەیەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی شیفا بەخش". پاشان ئایەتی سورەتی﴿النساء﴾: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە تزیکی نوێژ مەکەونەوە لەوکاتەی کە سەرخۆشن﴾ جا ئیتر بانگبێژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەوکاتەی کە قامەتی ئەکرد بانگی ئەکرد:(نزیکی نوێژ مەکەونەوە لەکاتێکدا ئێوە سەرخۆشن)، پاشان عومەر بانگکراو خوێنرایەوە بەسەریا و ئەویش فەرمووی: "ئەی پەروەردگارا بۆمان ڕوون بکەرەوە لەبارەی مەیەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی شیفا بەخش"، پاشان ئایەتی سوڕەتی﴿المائده﴾ هاتە خوارەوەو عومەر بانگکراو خوێندرایەوە بەسەریدا وە کاتێك گەیشتە ﴿دەسا ئیتر واز دێنن﴾ عومەر (خوای لیّ ڕازیبیّت)فەرمووی: (( وازمان هێنا وازمان هێنا )) .

[1] - مەی لە ساڵی (٣)ی کۆچی دوای شەڕی ئوحود حەڕامکرا. الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ٢٨٥/٦ ، ت:أحمد البردوني وإبراهيم أطفيش ، الناشر: دار الكتب المصرية – القاهرة ، الطبعة: الثانية، ١٣٨٤هـ

نازانم لـه دوای ئەم چیرۆکەو تێگەیشتنی پێشەوا عومەر و تەواوی هاوەڵان چی بڵێم و باسی چی بکەم؟!

چونکە ئەوان لـەگەڵ وەحیدا ژیاون و گوزەریان کردووەو ئەوان عەرەبی زانێکی باشبوون و چاك لـە مەبەست و واتای قورئان تێگەیشتوون و لـە وردەکاریەکانی زمان شارەزابوون و تێگەیشتوون لـە کنایە و زانیویانە بەچی مەبەستێك ئەم ئایەتەی کۆتا هاتووە ، وە هەروەها ئەوەی زیاتر ئەمەوێ سەرنجی ئێوەی بۆ ڕاکێشم ئەو بڕگەیە لـەوتەکەی پێشەوا عومەر کە فەرمووی(«اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانًا شَافِيًا») ئەم وتەیە زۆر دەقیق و وردەو پێویستی بە وەستان هەیە لـەسەری، چونکە داوای کردووە کە خوای گەورە زۆر بە ڕوونی باسی حوکمەکەی بکات و لـە وتەکەیدا چەند ئاماژەیەکی تیا بەکارهێناوە ، بۆنمونە:

١. بەکارهێنانی مەفعولـی متلـەق کە بۆ تەوکید و دووپاتکردنەوەی ئەو بابەتەیە کە تۆ باسی ئەکەیت ، چونکە واتاکەی بەم شێوەیە: "ئەی خوایە بۆمان ڕوون بکەرەوە بە ڕوونکردنەوە" بەتەنها نەیفەرمووە ڕوونی بکەوەو بەس ، بەڵکو تەوکیدی لـەگەڵدایە بەهۆی وشەی (بَيَانًا).
٢. بەکارهێنانی صیفەتێك بۆ ئەو ڕوونکردنەوەیە ئەویش(شَافِيًا) واتە ڕوونکردنەوەو بەیانێك بێت کە شیفا بەخش بێت و هیچ گومانێك گەڵاڵـە نەبێت دوای بیستنی، ئەمەش دیسانەوە خۆی بۆخۆی بەڵگەیەکی بەهێزە و جوان هەستی پێ ئەکرێت ئەگەر بێت و کەمێك وردبین لـەکاتی تێڕامان لـە دەقێکدا.

جا سەیر بکەن کاتێك ئیمامی عومەر داوای ئایەتێك ئەکات کە بەتەواوی بابەتەکە ڕوون بکاتەوە و هیچ گوومانێك نەمێنێتەوەو ، ئایەتەکەش بە ئیستفهام بێتەخوارەوەو بڵێ (ئیتر واز دێنن) و تەنها ئەوەی لێ بخوێنرێتەوە کە ئەوان سەرپشکن لە وازهێنان یاخود وازنەهێنانیان؟!

نا هەرگیز وانیەو بەوشێوەیە نیە کە ئەوانی باسی ئەکەن بەڵام ئەوان نەزانیان وای لێ کردوون بەو ئاقارەدا بچن و هەڵە لەبابەتەکە حاڵی بن وە ڕەنگە ئەصلەن هەر تێنەگەن کە ئێستا ئێمەش باسی چی ئەکەین و سەریان لێی دەرنەچێت هەروەکو شاعیر ئەڵێ[1]:

أَقُــولُ لَــهُ بَكْــرًا فَيَسْــمَعُ خَالِــدًا وَيَكْتُبُــهُ زَيْــدًا وَيَقْــرَؤُهُ عَمْــرَا

پێــی دەڵــێم بــەکرەو بەخالیــد گــوێی لــێ دەبــێ
بــە زەیــدی دەنوســێت و بــە عــەمری دەخــوێنێ

یان وەکو[2]:

يَعِـــي غَيْـــرَ مَـــا قُلْنَـــا وَيَكْتُـــبُ غَيْـــرَ مَـــا
وَعَـــاهُ وَيَقْـــرَأُ غَيْـــرَ مَـــا هُـــوَ كَاتِـــبُ

واتە:

چارچـــــیە بــــۆ دەردی وەهـــــا موبتــــەلایێ

[1] – الوسيط في تراجم أدباء شنقيط لأحمد بن الأمين الشّنْقِيطي ، ص:٥٥٣ ، الناشر: الشركة الدولية للطباعة — مصر- ، الطبعة: الخامسة، ١٤٢٢ هـ.

[2] – فتح المغيث للسخاوي ٢٥٣/٣ ، ت: علي حسين علي ، الناشر: مكتبة السنة — مصر- ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٤هـ

تـــێ دەگـــات ئـــەوەی کـــە وتمـــان بـــە خـــوارێ
ئـــــەو دڵـــــەی مـــــن لـــــەت لەتـــــە وا ئەســــەفا
ئەنوســـێ پێچـــەوانەی ئـــەو شـــتەی کـــە تێـــی دەگـــا
کـــەس نـــەکات لۆمـــەم لـــە هـــەجوی ئـــەم بەشـــەرە
ئـــەیخوێنێ پێچـــەوانەی کـــەلامێ کـــە بـــۆی نووســـەرە

## با پێغەمبەری خوا( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) حەکەم بێت !!

وەك زانراوە تاوەکو تەفسیری پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەبێت و ئەو تەفسیری بۆ ئایەتێك كردبێت ئاوڕ نادرێتەوە لای وتەی کەس بە هیچ شێوەیەك و تەفسیری کەسی تر قەبوڵکراو نیە ، چونکە موهمەی تەفسیر یەکێکە لە کار و پیشەکانی هەروەکو چۆن نێردراوە تەبلیغی دین بکات گەیاندنی گەورەترین ڕوکنیش بریتیە لە تەفسیری قورئانی پیرۆز، جا لەوبارەیەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوپەڕی حەڕام بوونی ڕوون دەکاتەوەو ئەفەرموێت:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْخَمْرَ، وَشَارِبَهَا، وَسَاقِيَهَا، وَبَائِعَهَا، وَمُبْتَاعَهَا، وَعَاصِرَهَا، وَمُعْتَصِرَهَا، وَحَامِلَهَا، وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ»[1].

واتە:

لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازیبێت) ئەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: خوای گەورە نەفرینی کردووە لە مەی و ئەو کەسەشی کە ئەیخواتەوەو ئەوەشی کە ئەیگێڕێت و ئەوەشی کە

[1] – صححه الألباني والأرناؤوط، رواه أبو داود ٣٢٦/٣ ، برقم: ٣٦٧٤ ، ت:محمد محيي الدين عبد الحميد ، الناشر: المكتبة العصرية، صيدا – بيروت– . وأحمد في المسند ٩/١٠ ، برقم: ٥٧١٦ . والبيهقي في الكبرى ٥٣٤/٥ ، برقم: ١٠٧٧٨ ، ت: محمد عبد القادر عطا ، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنات– الطبعة: الثالثة، ١٤٢٤ هـ.

ئەیفرۆشێ و ئەوەشی کە ئەیکرێ و ئەوەشی کە ئەیگوشێ و ئەوەشی بۆی گوشراوەو ئەوەشی کە باری ئەکات و ئەوەشی بۆی بارکراوە.

باشە تۆ بلێی ئەم گشتە نەفرینە هەر لە خۆوە هاتبێت و بۆ شتێکی (مەکروە) هاتبێت، بێگومان نەخێر چونکە ئەو هەموو ترساندنە تەنها دەرحەق بە شتێکە کە لە ئەصل و بنچینەدا حەڕام بێت.

وەهەروەها لەفەرموودەیەکی تردا ئەفەرموێ:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مُدْمِنُ الْخَمْرِ، كَعَابِدِ وَثَنٍ»[1].

واتە:

لە ئەبوهورەیرەوە پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)فەرمووی: ئەو کەسەی کە وابەستەی مەی بووە وەکو بتپەرست وایە.

ئەم فەرموودەیە مەبەست پێی بەکافردانانی مەیخۆر نیە بەڵکو مەبەست پێی ترساندن و گەورە نیشاندانی ئەم حەڕامەیە لەکاتێکدا بەم شێوەش وەسف کراوە هێشتا خەڵکانێك جورئەت ئەکەن و ئەڵێن حەڕام نیە ، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە کەسێك کە وابەستەی مەی بووە ، هەروەکو گوێرەکە پەرستەکانی بەنی ئیسرائیل چۆن ئەوانیش خۆشەویستی و هۆگربوونی گوێرەکە چووبوە دڵ و ناخ و هەناویانەوەو نەیانەتوانی وازی لێبێنن و ببنە

---

[1] – صحَّحَه الألبانيُّ وضعَّفَهُ البعضُ: رواه ابن ماجة٢/١١٢٠ ، برقم: ٣٣٧٥ ، ت: محمد فؤاد عبد الباقي ، الناشر: دار إحياء الكتب العربية – فيصل عيسى البابي الحلبي

خواپەرست ، جا کەسی مەی خۆریش کاتێك کە وابەستەی ئەبێت وای لیَ دێت.

بەهەرحاڵ ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە باسی بکەین و ئەمانەویَ ئاماژەی پیَ بکەین ئەوەیە کە پێغەمبەری خۆشەویستمان(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاماژەی کردووە بە گەورەیی ئەم تاوانەو گرێدانی بە بت پەرستی و لەگەورەییەکەشیدا ئەفەرمویَ خوای گەورە لەعنەتی کردووە لە هەموو ئەوانەی کە دەستیان هەیە لە بابەتی مەی و ئاسانکاری دەکەن بۆ خەڵکی و هەر پشکێکیان هەبێت لەوبارەیەوە

جا سەیرتر لە سەیر ئەوەیە دوای ئەمە کەسێك بێت و بڵیَ کاکەی مەی حەڕام نیەو کەس ناتوانیَ بڵیَ حەڕامەو لە قورئاندا حەڕام نەکراوە!!

## بۆچی خوای گەورە نەیفەرمووە حەرامە مەی ؟!

هەرچەندە ئێمە هەوڵ بدەین و خۆمان ماندوو بکەین و بمانەوێ حیکمەت و هۆکارێکی شەرعی بدۆزینەوە باسی بکەین هەر چەمکێکیمان بۆ دەرکەوێت و چەندین لاو گۆشەیمان لێ ونبێت و پەی نەبەین بە حەقیقەتی هۆکارەکەی و حیکمەتی شەرعی لە پشت ئەو تەشریعەوە .

بەڵام ئەو گۆشەیەی کە بۆ ئێمە دەرکەوتوەو ئەیبینین ئەوەیە کە خوای گەورە نەیفەرمووە حەرامە بەڵکو فەرمویەتی نزیکی نوێژ مەکەونەوە لەکاتی سەرخۆشیدا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النساء: ٤٣

یان فەرمویەتی وازی لێ بێنن و توخنی مەکەونەوە ، وەکو سورەتی ﴿المائدە﴾: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ .

خوای گەورە فەرمووی لێی دوور بکەونەوەو وازی لێ بێنن و نەیفەرموو حەرامە، ئەتوانین ئەوەی لێ تێبگەین کە مەی ئەگەر حەرام بێت و کەسێك ناچاربێت و بۆ نەخۆشی بەکاری بێنێ ئەوا ڕەنگە ڕێگەی بۆ بکرێتەوەو

بەتایبەتتر ئەگەر نەخۆشیەکەی کوشندەبێت، چونکە ناچاری حەرام کراوەکان حەلآڵ دەکات وەکو لە بنەما ئصولێەکان باسکراوە: ﴿الضَّرُورَاتُ تُبِيحُ الْمَحْظُورَاتِ﴾[1].

جا بۆیە خوای گەورە فەرمویەتی لێی دووربکەونەوە بۆ ئەوەی لە هیچ باروو زروفێك و بۆ نەخۆشیش بەکاری نەهێنن و نەخەڵەتێن بەوەی کە هەندێك لە دکتۆرەکان ئەیلێن کە مەی چارەسەرە بۆ هەندێك نەخۆشی، وە ئەوەی کە تا ئێستا جێگیرە لە زانستی پزیشکیدا مەی هیچ سوود و قازانجێکی نیە ئیلا زەرەرو لێکەوتەکانی زیاترن و چەندین نەخۆشی تر بەدوای خۆیاندا دێنن ، وە سوود و چارەسەرەکەشی لە ئاو زیاتر نیە بۆ هەندێك نەخۆشی وەکو گورچیلە وە ئێمە نایەین تیشك بخەینە سەر ئەم لایەنەو بەکراوەیی جێی دێڵێن و ئەتوانن بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی ئەو لێکۆڵینەوانە بخوێننەوە کە لەو بارەیەوە پێشکەشکراون، جا بەڕاستی ئەتوانین لەم ئایەتەوە فەهمی ئەوە بکەین کە خوای گەورە ئاماژەی بەوە کردووە لە گشت بارو زروفێك مەی بەکارنەهێنرێت و زەرەرو زیانێکی یەکجار زۆری هەیە بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و ژیانیان لێ تاڵ و وێران ئەکات ، هەر وەکو ئەمڕۆ ئەیبینین و لەپێش چاومانە ئەو هەموو نەهامەتیەی کە بەهۆی مەیەوە زۆر لە کۆمەڵگەکان تووشی بوون .

---

[1] – الفروق للقرافي ١٤٦/٤ ،دار عالم الكتب ، بدون طبعة وسنة النشر ، والأشباه والنظائر للسبكي ٤٥/١ ، دار الكتب العلمية ، الطبعة: الأولى ١٤١١هـ . والموافقات للشاطبي ٩٩/٥ ، ت:أبي عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان ، الناشر: دار ابن عفان ، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤١٧هـ.والمنثور للزركشي ٣١٧/٢ ، ط: وزارة الأوقاف الكويتية، الطبعة الثانية، ١٤٠٥هـ.وفتح القدير لابن همام الحنفي٣٤٨/٤ ، دار الفكر ، الطبعة: بدون طبعة وبدون تاريخ.

وە ئەوەشی کە زیاتر پشت ڕاستی ئەم بۆچونە ئەکات ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەفەرموێ:

عَنْ دَيْلَمٍ الْحِمْيَرِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضٍ بَارِدَةٍ نُعَالِجُ فِيهَا عَمَلًا شَدِيدًا، وَإِنَّا نَتَّخِذُ شَرَابًا مِنْ هَذَا الْقَمْحِ نَتَقَوَّى بِهِ عَلَى أَعْمَالِنَا وَعَلَى بَرْدِ بِلَادِنَا، قَالَ: «هَلْ يُسْكِرُ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «فَاجْتَنِبُوهُ» ...»[1].

لە "دەیلەمی حیمیەری"ەوە (خوای لێ ڕازیبێت) ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ، ئێمە لەزەوی(وڵات)ێکی ساردین و کاری سەخت ئەکەین ، وە خواردنەوەیەك درووست ئەکەین لەم گەنمە وە هێز ئەدەین بەخۆمان بەهۆی ئەوە لەسەرمای وڵاتەکەمان ، فەرمووی: ئایا سەرخۆشتان دەکات؟ ، وتم: بەڵێ ، فەرمووی: خۆتانی لێ بەدوور بگرن .

وەهەروەها لە فەرموودەیەکی تردا ئەفەرموێ:

عَنْ طَارِقِ بْنِ سُوَيْدٍ الْحَضْرَمِيِّ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بِأَرْضِنَا أَعْنَابًا نَعْتَصِرُهَا، فَنَشْرَبُ مِنْهَا؟ قَالَ: «لَا» فَرَاجَعْتُهُ، قُلْتُ: إِنَّا نَسْتَشْفِي بِهِ لِلْمَرِيضِ، قَالَ: «إِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ بِشِفَاءٍ، وَلَكِنَّهُ دَاءٌ».[2]

واتە:

---

[1] – صححه الألباني: رواه أبو داود ٣٢٨/٣ ، برقم:٣٦٨٣ ، ت: محمد محيي الدين عبد الحميد، الناشر: المكتبة العصرية، صيدا — بيروت.

[2] – الألباني والأرناؤوط صححاه: رواه أحمد في المسند ١٧٩/٣٧ ، برقم: ٢٢٥٠٢ ، وابن ماجة ١١٥٧/٢ ، برقم: ٣٥٠٠ ، ت: محمد فؤاد عبد الباقي ، الناشر: دار إحياء الكتب العربية – فيصل عيسى البابي الحلبي.

له (طَارِقِ بْنِ سُوَيْدٍ الْحَضْرَمِيِّ)یەوە ئەفەرموێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە زەوی ئێمە ترێ گەلێکی لێیە و ئەیانگوشین ، ئایا لێیان بخۆینەوە؟ فەرمووی: نەخێر،جارێکی تر لێم پرسیەوە ئێمە چارەسەری نەخۆشی پێ ئەکەین ، فەرمووی: بەدڵنیاییەوە ئەوە دەرمان نیە بەڵکو دەردە.

بەڵێ ئێمەش دڵنیایین لەوەی کە دەردەو نابێتە شیفاو شیفا لە قەدەغەکراوەکانی خوای گەورەدا نیە، وە کۆڕای زانایان لەسەر ئەوەیە کە نابێت مەی بۆ چارەسەر بەکاربێت ، هەر وەکو ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا بابێکی داناوە بەناوی ﴿بَاب تَحْرِيمِ التَّدَاوِي بِالْخَمْرِ وَبَيَانِ أَنَّهَا لَيْسَتْ بِدَوَاءٍ﴾[1].

وە زۆرێك لە زانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێت لە کتێبەکانیان باسی ئەم بابەتەیان کردووە بۆ زیاتر خوێندنەوە ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەم سەرچاوانە[2].

---

(1) – شرح النووي على مسلم ١٥٢/١٣ ، دار إحياء التراث العربي – بيروت ، الطبعة: الثانية، ١٣٢٩.

(2) – معالم السنن للخطابي ٢٢٣/٤ ، المطبعة العلمية – حلب ،الطبعة: الأولى ١٣٥١ هـ. وفتح الباري لابن حجر العسقلاني ٨٠/١٠ ، الناشر: دار المعرفة - بيروت، ١٣٧٩هـ. ونيل الأوطار للشوكاني ٧٠/١ ، ت: عصام الدين الصبابطي ، الناشر: دار الحديث، مصر ، الطبعة: الأولى، ١٤١٣هـ.

## چی بێ ئاگاییەك بە مەبەستی شەریعەت !!

ئەگەر بڕوانینە حوكم و بڕیارەكانی شەریعەت ئەبینین هەمیشە ڕچاوی سوود و قازانجی خەڵكی كراوەو شتێكی لە پێشچاوگیراوە لە تەواوی بڕیارەكان و شەریعەت بۆ كۆمەڵێك مەبەستی گرنگ هاتوەو ئەوەی كە زۆرینەی زانایانی لەسەرە ﴿مَقَاصِدُ الشَّرِيْعَةِ﴾ بریتیە لە پێنج دانە و یەكێكیش لەوانە بریتیە لە "پاراستنی عەقڵ و ژیری" هەر وەكو ئیمامی زەركەشی ئەفەرمویێت:(خَامِسُهَا – حِفْظُ الْعَقْلِ)[1]. واتە: پێنجەمیان بریتیە لە پاراستنی عەقڵ و ژیری.

زۆر سەیرە لەدوای ئەمە كەسێك بێت و بڵێ مەی حەڕام نیە لەكاتێكدا ئەبێتە هۆی لەناوبردن و خامۆشكردنی شتێك كە شەریعەت بۆ پاراستنی هاتووە و ئەویش بریتیە لە عەقڵ، لەكاتێكدا نەمانی عەقڵ و خامۆشبوونی ئەبێتە هۆی دەستەبەربوونی چەندین كێشەو گرفت كە ڕۆژانە ئەبیستین چەندین ڕووداوی ناخۆش لە دنیادا بەهۆی عارەق خواردن و مادەهۆشبەرەكانەوە ڕوو دەدات و هۆكارەكەی لەدەست چوونی عەقڵ و ژیرییە ، چەندێكمان بیست كە خەڵكانێك كەسی نزیكی خۆیانیان كوشتوە هەر لە دایك و خێزان و براو ....، چەندێكی تر لە ڕووداوی هاتووچۆ بوە هۆی تیاچوونی خۆی و غەیری خۆشی ؟!

---

[1] – البحر المحيط للزركشي ٢٦٦/٧ ، دار الكتبي ، ط: الأولى، ١٤١٤هـ. والتحبير شرح التحرير لعلاء الدين الحنبلي ٣٣٨١/٧ ، ت: د. عبد الرحمن الجبرين، د. عوض القرني، د. أحمد السراح الناشر: مكتبة الرشد – السعودية / الرياض ، ط: الأولى، ١٤٢١هـ.و المستصفى للغزالي ، ص:٣٢١ ، محمد عبد السلام عبد الشافي ، دار الكتب العلمية ، ط: الأولى ١٤١٣هـ. وتيسير التحرير لأمير بادشاه الحنفي ٣٠٦/٣ ، دار الفكر–بيروت– . و إرشاد الفحول للشوكاني ١٣٠/٢ ، ت: أحمد عزو ، دار الكتاب العربي ، ط: الأولى ١٤١٩. والمذكرة للشنقيطي ، ص:٥٠ ، مكتبة العلوم والحكم، المدينة المنورة ، الطبعة: الخامسة، ٢٠٠١ م.

**وه چەندین ڕووداوی دڵتەزێن کە ڕوویانداوەو ڕوو ئەدەن ، جا سەیر لەوەدایە لە دوای ئەمە کەسێك بێت و بڵێ مەی مەکروهە و حەڕام نیە !!**

**چۆن خەڵکانێك لەدوای ئەمە جورئەتی قسە ئەکەن و دێن لەم بارەیەوە ئەدوێن لەکاتێدا هیچ کەسێکی ژیر و عاقڵ وەها وتەیەك لە زاریەوە نایەت ، بەڵام پێ ئەچێت ئەو جۆرە کەسانە پێش شەرعیەت دان بە مەی خۆیان سەرخۆش بوبێتن بە مەی و عارەقی شوبوهات و شەهەوات عەقڵیان مەستی نەزانی بوبێت و دەرکی حەقیقەت نەکات.**

**بەڕاستی لەدوای ئەمە هەر کەسێك جورئەتی ئەوە بکات و بڵێ مەی لە قورئاندا حەڕام نەکراوە ئەوا هیچ وتەیەك بۆی شیاو نیەو چارەسەری نیە هەر وەکو وتراوە[1]:**

**لِكُـــــــلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ يُسْـــــــتَطَبُّ بـــــــهِ**
**إلاَّ الْحَمَاقَـــــةَ أَعْيَـــــتْ مَـــــنْ يُـــــدَاوِيهَا**

**لـــــەبۆ گشـــت دەردێـــك هەیـــە چارەســـەر**
**بـــێ لـــە گـــەوجێی ئـــەتکا قـــوڕ بەســـەر**

---

[1] - العقد الفريد لابن عبد ربه ٢٢٦/٢ ، دار الكتب العلمية – بيروت ، الطبعة: الأولى، ١٤٠٤ هـ. والأدب والأدباء للراغب ٢٨/١ ، شركة دار الأرقم بن أبي الأرقم – بيروت- ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٠ هـ. وربيع الأبرار للزمخشري ٣٩/٢ ، مؤسسة الأعلمي، بيروت ، الطبعة: الأولى، ١٤١٢ هـ. المستطرف في كل فن مستطرف لأبي الفتح الأبشيهي ، ص:٢٣ ، عالم الكتب – بيروت-الطبعة: الأولى، ١٤١٩ هـ.

## عەرەب و ( مەی ) پێش هاتنی ئیسلام !!

ئەوەی کە من ئەویٚ لێرە ئاماژەی پیٚ بکەم ئەوەیە کە عەرەب پێش ئیسلام سەرەڕای ئەوەی کە زۆرێکیان ئالودەی مەی بوبوون و بەبیٚ مەی ژیانیان نەبووە ، لەبەرامبەر ئەمەشدا خەڵکانێك هەبوون کە (مەی)یان بە شتێکی نابووت تەماشاکردوەو هەرگیز خۆیان لیٚ نەداوەو بە سیفەتێکی ناشرینیان زانیوە ، هەروەکو "زوهەیری کوڕی ئەبی سولما" وەسفی "حصنی کوڕی حوزەیفەی فیزاری" ئەکات بەوەی کە مەی نەخواردوەتەوە وسەروەت و سامانی خۆی تیادا سەرف نەکردووە[1]:

أخـــــي ثِقَــــةٍ لا تُهْلِــــكُ الخَمْــــرُ مَالَــــه

ولكنَّــــه قــــد يُهلِــــك المــــالَ نائلُــــهْ

وەهەروەها حەکیمی عەرەب "عامری کوڕی زەربی عدوانی" لەدوای ئەوەی ئەو هەموو کاریگەریە خراپەی مەی ئەبینیٚ لەسەر خۆی حەڕام ئەکات و لەو بارەیەوە ئەڵیٚ[2]:

---

(1) - الشعر والشعراء لابن قتيبة الدينوري ١/١٥٠ ، الناشر: دار الحديث، القاهرة ، عام النشر: ١٤٢٣ هـ ، وعيون الأخبار له ١/٤٦٤ ، دار الكتب العلمية –بيروت ، تاريخ النشر: ١٤١٨ هـ ، عيار الشعر لأبي الحسن العلوي ، ص: ١٣٩ ، ت: عبد العزيز بن ناصر المانع ، الناشر: مكتبة الخانجي – القاهرة- ، "لكنه قد غير فيه" ، نقد الشعر لقدامة بن جعفر ، ص:٢١ ، مطبعة الجوائب – قسطنطينية- ، الطبعة: الأولى، ١٣٠٢هـ ، وشرح شواهد المغني ٢/٩٤٠ ، وقف على طبعه وعلق حواشيه: أحمد ظافر كوجان ، مذيل وتعليقات: الشيخ محمد محمود ابن التلاميد التركزي الشنقيطي ، الناشر: لجنة التراث العربي ، الطبعة: بدون، ١٣٨٦ هـ.

(2) – أمالي القالي ١/٢٠٤ ، عني بوضعها وترتيبها: محمد عبد الجواد الأصمعي، الناشر: دار الكتب المصرية، الطبعة: الثانية، ١٣٤٤ هـ ، ومحاضرة الأدباء للراغب ١/٧٧٧ ، شركة دار

سَـــأَلَّةٌ لِلفَتَـــى مَـــا لَـــيْسَ فِـــي يَـــدِهِ
ذَهَّابَـــــةٌ بِعُقُـــولِ القَـــوْمِ وَالمَـــــالِ
أَقْسَـــــمْتُ بِاللَّــــهِ أَسْـــقِيهَا وَأَشْــــرَبُهَا
حَتَّـــى يُفَـــرِّقَ تُـــرْبُ القَبْـــرِ أَوْصَـــالِي
مُورِثَـــــةُ القَـــوْمِ أَضْـــغَانًا بِـــلا إِحَـــنِ
مُزْرِيَـــــةٌ بِـــــالفَتَى ذِي النَّجْـــدَةِ الحَـــالِي

واته:

ئـــــەيكا تەنانـــــەت تەلـــــەبی مەعـــــدوم
ئـــەيبات بـــەتێكڕا عـــەقلّ و هـــۆش مـــەردوم
بـــەخوا ســـوێندئەخۆم نـــايخۆم تـــا ئەبـــەد
هـــەتاوەك ئەچـــمە نـــاو گـــۆڕو ئەلحـــەد
ئـــــەيهێنێت ڕق و حقـــــد و كينــــەی زۆر
ئـــەيكات ســـەربلّند بـــیٚ ئـــەزش و شـــۆڕ

وەهەروەها چەندین چیرۆكی سەیریش لەو بارەیەوە هاتووە كە هەندێكیان لەبەر ئەوەی شتێكیان بەسەر هاتووە بەهۆی مەیەوە وازیان لێی هێناوەو تەركیان كردووە بۆ ئەبەد ، هەروەكو ئەگێڕنەوە لە "قەیسی كوڕی عاصم ی منقری" كە پێش مسولّمان بوونی جارێك مەی خواردوەتەوە لەوكاتەی كە

---

الأرقم بن أبي الأرقم – بيروت- ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٠ هـ. ، وربيع الأبرار للزمخشري ٢٦/٥ ، نهاية الأرب في فنون الأدب لشهاب الدين النويري ٨٩/٤ ، دار الكتب والوثائق القومية، القاهرة،الطبعة: الأولى، ١٤٢٣ هـ.

هۆشی بەخۆیەوە نەماوە پەلاماری مانگی داوەو وتویەتی سوێند ئەخۆم تاوەکو داینەگرم واز ناهێنم !!

کاتێك بەیانی بوەتەوە هەواڵیان پێی داوە کە شتێکی وابووە ، ئیتر ئەویش هەست بەشەرمەزاری ئەکات و بڕیار ئەدات جارێکی تر مەی نەخواتەوە، وە هەروەها عەباسی کوڕی میرداس و غەیری ئەمانیش نمونە گەلێکن لەم بارەیەوە[1].

زۆرم پێ سەیرە لەکاتێکدا ئەم سەردەمە پێی ئەوترێت سەردەمی نەفامی و نەزانی،بەڵام ئەوانەیان کە کەمێك گەڕاونەتەوە سەر سروشتی پاکی خۆیان وازیان لەمەی هێناوەو جارێکی تر نزیکی نەکەوتونەتەوە لەکاتێکدا کە غەیری خۆیانیان بینیوە چیان بەسەرادێت یاخود ئەو ڕووداوانەی کە بەسەرخۆیان هاتوەو بێ ئاگابوون و دواتر بۆیان باسکراوە ئیتر بە یەکجاری تەرکیان کردوە، جا ئەگەر بێت و کەسێك ئاگاداری ئەم چیرۆکانەبێت و ببینێت کە چۆن بە فیترەتی پاك وازیان لەمەی هێناوە و لەولاشەوە خەڵکانێك بڵێن ئیسلام دینی فیترەت و سرووشتی پاکی مرۆڤەو بەڵام مەی حەرام نەکراوە تیایدا ، ئایا ئەمە لە هیچ پێوەرێکی ڕاست و درووست جێی ئەبێتەوە !؟

---

(1) – المستطرف في كل فن مستطرف، لأبي الفتح الأبشيهي ، ص:٤٦٧

## حوكمی كەسێك بڵێ مەی حەڕام نیە

زانایانی ئوممەت ڕەحمەتی خوایان لێبێت دوای ئەوەی كە باسیان كردووە مەی چی ترسناكی و خەتەرەیەكی گەورەی بۆ مرۆڤایەتی و كۆمەڵگا هەیە، باسی ئەوەشیان كردوە ئەگەر بێت و كەسێك مەی بەحەڕام نەزانێت یاخود بڵێ مەی حەڕام نیە حوكمی چیە.

كەسێك كە ئینكاری بابەتێك بكات كە بەڵگەكەی ئاشكراو دیارەو شاراوە نیە لای خەڵكی وەكو لای زانایان مەشهورە بە (المَعْلُومُ مِنَ الدِّيْنِ بالَّضَّرُورَةِ) واتە ئەوەی كە بە پێویستی زانراوە لە ئاییندا ، یانی بەڵگەكانی مەشهورن و هیچ گومان و دوودڵیەك هەڵناگرن و بەربڵاون لەناو تەواوی خەڵكی ، جا ئەگەر حەڕامێك بێت و بەحەڵاڵی بزانن یاخود بەپێچەوانەوە ئەوا فەرموویانە كوفرە و دەرچوونە لە دین ، هەروەكو پێشەوا ئیبن عەبدلبەڕ "ڕەحمەتی خوای لێبێت" ئەفەرموێ: "وَقَدْ أَجْمَعُوا أَنَّ مُسْتَحِلَّ خَمْرِ الْعِنَبِ الْمُسْكِرِ كَافِرٌ رَادٌّ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ خَبَرَهُ فِي كِتَابِهِ مُرْتَدٌّ يُسْتَتَابُ فَإِنْ تَابَ وَرَجَعَ عَنْ قَوْلِهِ وَإِلَّا اسْتُبِيحَ دَمُهُ كَسَائِرِ الْكُفَّارِ"[1].

واتە: زانایان ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی كە ئەوكەسەی عارەقی گوشراوی ترێ بەحەڵاڵ بزانێ كافرەو فرمانی خوای گەورە ڕەت كردوەتەوە و مورتەد بووە و داوای تۆبەی لێ ئەكرێ ئەگەر تۆبەی كرد و گەڕایەوە لە وتەكەی ئەوا باشە ئەگینا خوێنی حەڵاڵ ئەبێت وەكو تەواوی كافرانی تر.

---

[1] - التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد لابن عبدالبر ١/١٤٣ ، مصطفى بن أحمد العلوي , محمد عبد الكبير البكري ، الناشر: وزارة عموم الأوقاف والشؤون الإسلامية – المغرب- ، عام النشر: ١٣٨٧ هـ.

وەهەروەها ئیمامی نەوەوی گەورە زانای مەزهەبی ئیمامی شافیعی لەبارەکی کەسێکەوە کە حەرامێك بەحەڵاڵ بزانێت یان بەپێچەوانەوە و چەندین کوفری تر باس ئەکات و ئەفەرموێ:" أَوِ اسْتَحَلَّ مُحَرَّمًا بِالْإِجْمَاعِ كَالْخَمْرِ وَاللِّوَاطِ، أَوْ حَرَّمَ حَلَالًا بِالْإِجْمَاعِ، أَوْ نَفَى وُجُوبَ مُجْمَعٍ عَلَى وُجُوبِهِ... فَكُلُّ هَذَا كُفْرٌ"[١].

واتە: یان بەحەڵاڵی بزانێت شتێك کە حەرامە بە ئیجماع وەکو مەی و نێربازی، یان حەڵاڵێك بەحەرام بزانێت ، یان ئینکاری واجب بوونی واجبێك بکات کە بە ئیجماع واجبە ...ئەمانە هەمووی کوفرە.

وەهەروەها (القاضي عياض) گەورە زانای مالکیەکان ئەفەرموێ:

" وَكَذَلِكَ أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى تَكْفِيرِ كُلِّ مَنِ اسْتَحَلَّ القتلَ، أَوْ شُرْبَ الْخَمْرِ، أَوِ الزِّنَا، مِمَّا حَرَمَ اللَّهُ بَعْدَ عِلْمِهِ بِتَحْرِيمِهِ.."[٢].

واتە: وەهەروەها تەواوی مسوڵمانان کۆکن لەسەر کافرکردنی هەرکەسێك کوشتنی ناحەق بە حەڵاڵ بزانێ، یان خواردنەوەی مەی ، یان زینا ، لەو شتانەی کە خوای گەورە حەرامی کردووە دوای زانستی بەوەی کە حەرامە.

واتە ئەگەر نەزان نەبێت و بەڵگەکان بزانێت ئەوا دوای ئەوە زانایان بەکافریان داناوە.

---

[١] - روضة الطالبين للنووي ٦٤/١٠ ، تحقيق: زهير الشاويش ،الناشر: المكتب الإسلامي، بيروت- دمشق- عمان- ، الطبعة: الثالثة، ١٤١٢هـ.

[٢] - الشفا بتعريف حقوق المصطفى للقاضي عياض ٦١١/٢-٦١٢،دار الفيحاء — عمان-، الطبعة: الثانية - ١٤٠٧ هـ.

بەلاَم گرنگە لێرەدا ئاماژە بە خالێکی گرنگ بکەین ئەویش ئەوەیە ئەم بابەتە بە شێوەیەکی ڕەها نیە و نابێت خێرا هەولّی تەکفیر و تەفسیقی بەرامبەر بدەین بەلّکو یاساو ڕێسای هەیەو پێویستە ڕەچاوبکرێت، بەلاّم بەداخەوە ئەمڕۆ زۆر گویٚ نادرێت بە خوێن و مالّی بەرامبەر و بەشێوەیەکی زۆر ئاسان و سانا سەیر ئەکرێت لەلایەن زۆر کەسەوە کە ئەمەش بەڕاستی کارەساتێکی گەورەیەو پێویستە گشت لایەك ئاگاداری بین، جابۆیە ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێبێت ئەفەرمویٚ لە بارەی وتەی ئیمامی ڕافیعی کە ئەو بابەتە باس ئەکات و لە کتێبەکەیدا لە حوکم و باسی مورتەد:

"قُلْتُ: قَوْلُهُ: إِنَّ جَاحِدَ الْمُجْمَعِ عَلَيْهِ يَكْفُرُ، لَيْسَ عَلَى إِطْلَاقِهِ، بَلِ الصَّوَابُ فِيهِ تَفْصِيلٌ سَبَقَ بَيَانُهُ فِي بَابِ تَارِكِ الصَّلَاةِ عَقِبَ كِتَابِ الْجَنَائِزِ، وَمُخْتَصَرُهُ: أَنَّهُ إِنْ جَحَدَ مُجْمَعًا عَلَيْهِ يُعْلَمُ مِنْ دِينِ الْإِسْلَامِ ضَرُورَةً، كَفَرَ إِنْ كَانَ فِيهِ نَصٌّ، وَكَذَا إِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ نَصٌّ فِي الْأَصَحِّ، وَإِنْ لَمْ يُعْلَمْ مِنْ دِينِ الْإِسْلَامِ ضَرُورَةً بِحَيْثُ لَا يَعْرِفُهُ كُلُّ الْمُسْلِمِينَ، لَمْ يَكْفُرْ. وَاللَّهُ أَعْلَمُ"[1].

واتە: ئەلّێم(ئیمامی نەوەوی): وتەکەی(ئیمامی ڕافیعی): بەدلّنیاییەوە ئینکاریکەری بابەتێك کە ئیجماعی لەسەرە کافر ئەبێت، بەو ڕەهاییە نیە، بەلّکو ڕاست و درووست ئەوەیە تفصیلی تیایە کە ڕابورد لە پێشتر لە باسی نوێژدا دوابەدوای کتابی جەنازە ، وەکورتەکەی ئەوەیە: ئەگەر هات و ئینکاری شتێکی ئیجماعی لەسەرەو زانراوە لە دیندا بە پێویستی ، ئەوا کافر

[1] - روضة الطالبين للنووي ١٠/٦٥ ، وەك زانراوە کتێبی ﴿المنهاج﴾ی ئیمامی نەوەوی مختصری کتێبی﴿شرح الوجيز﴾ی ئیمامی ڕافعیە

ئەبێت ئەگەر هات و بەڵگەی لەسەربوو ئەوشتە ، وە هەروەها بەهەمان شێوە ئەگەر نبەڵگەی لەسەر نەبوو بەپێی ڕای درووست ، وە ئەگەر هاتوو شتێك نەبوو کە زانرابێت بە پێویستی و بەشێوەیەك نە بێت کە تەواوی مسوڵمانان بیزانن ئەوا کافر نابێت. وەخوای گەورەش زاناترە.

جا لەم باریەوە وتەی زانایان گەلێك زۆرەو بەوەندە دڵی خۆمان تێر ئاو دەکەین و ئەیکەینە ڕووناکی دیدەمان و ئەگەر کەسێکیش زیادەی بوێت ئەوا لە کتێبە فقهیەکان و شەرحی فەرموودەدا باسکراون و ئەتوانن بگەڕێنەوە سەریان.

## پەیامی کۆتایی

لەکۆتایی ئەم بابەتە کورتەی بەردەستان ئەمەوێ ئەوە بڵێم:

زۆربەی زۆری ئەوانەی کە تەفسیری هەڵە ئەکەن بۆ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە ڕاست و درووستەکان بەهۆی نەبوونی ئالەتی تەفسیر و پێویستیەکانیان یەتی کە گرنگترینیان بریتیە لە زمانی عەرەبی و زانستی ئصول ، جا بۆیە زۆربەی کات هەڵەی ئەوان بریتیە لە نەزانینیان بە زمانی عەرەبی و ڕێساکانی بۆیە ئەڵێم ئەممان ئەی جیلی تازەپێگەیشتووی ڕابوونی ئیسلامەتی هەرگیز نەکەن لەبایەخی ئەو دوو زانستە بێننە خوار و خەریکیان نەبن چونکە بەو دوو زانستە ئەتوانن هەڵەو کەم و کورتیەکانی ئەوان بۆ خەڵکی بەیان بکەن و ڕێگەی چەواشەکردنیان لێ بگرن و نەهێڵن جارێکی تر لە هیچ بابەتێك بەگوێرەی هەوای خۆیان قسە بکەن.

لەکۆتاییدا داواکارم لەخوای گەورە کاروکردەوەکانمان لێ وەرگرێت و ئەم نووسینەش بکاتە مایەی نەجاتی خۆم و هەرکەسێك ڕۆژێك لە ڕۆژان هۆکاری فێربوونم بووە لە سەرووی هەموویانەوە دایك و باوکی شیرینم و خێزانم .

وَ آخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُللهِ رَبِّ العَالَمِيْنَ، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى المبْعُوْثِ رَحْمَةً للعَالَمِيْنَ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَمَنْ وَلاهُ

مروان الكردي

سليماني/مجيد بك

# سەرچاوەکان


١. القرءان الكريم

٢. شرح النووي على مسلم ١٥٢/١٣ ، دار إحياء التراث العربي – بيروت ، الطبعة: الثانية، ١٣٢٩.

٣. الإحكام للآمدي ١٤٨/٢ ، ت: عبد الرزاق عفيفي ، الناشر: المكتب الإسلامي، بيروت- لبنان- ،

٤. أدب الطلب للشوكاني ، ص: ١٥٧ ، المحقق: عبد الله يحيى السريحي ، الناشر: دار ابن حزم - لبنان / بيروت ، الطبعة: الأولى، ١٤١٩هـ.

٥. الأدب والأدباء للراغب ٢٨/١ ، شركة دار الأرقم بن أبي الأرقم – بيروت- ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٠ هـ.

٦. إرشاد الفحول للشوكاني ١٣٠/٢ ، ت: أحمد عزو ، دار الكتاب العربي ، ط: الأولى ١٤١٩.

٧. أمالي القالي ٢٠٤/١ ، عني بوضعها وترتيبها: محمد عبد الجواد الأصمعي، الناشر: دار الكتب المصرية، الطبعة: الثانية، ١٣٤٤ هـ ،

٨. الإنصاف لابن الأنباري ٥٧٨/٢ ، المكتبة العصرية ، الطبعة: الأولى ١٤٢٤هـ.

٩. البحر المحيط ٣٥٩/٤ ، ت: صدقي محمد جميل، الناشر: دار الفكر – بيروت- الطبعة: ١٤٢٠ هـ.

١٠. البحر المحيط للزركشي ٢٦٦/٧ ، دار الكتبي ، ط: الأولى، ١٤١٤هـ.

١١. بيان المختصر شرح مختصر ابن الحاجب ٣٩٦/١ ، ت: محمد مظهر بقا ، الناشر: دار المدني، السعودية ، الطبعة: الأولى، ١٤٠٦هـ.

١٢. البيان والتحصيل لابن رشد ١٨٩/٣و٢٨٠/١٦ ت: د.محمد حجي وآخرون، الناشر: دار الغرب الإسلامي، بيروت – لبنان- ، الطبعة: الثانية، ١٤٠٨ هـ.

١٣. التحبير شرح التحرير لعلاء الدين الحنبلي ٣٣٨١/٧ ، ت: د. عبد الرحمن الجبرين، د. عوض القرني، د. أحمد السراح الناشر: مكتبة الرشد - السعودية / الرياض ، ط: الأولى، ١٤٢١هـ.

١٤. تلخِيص المِفْتَاحِ مَعَ المطَوَّل للتفْتَازَانِي ص: ٦٤٨ ، تعليق: أحمد عناية ، دار الكوخ ، ط: الأولى ١٣٨٧

١٥. التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد لابن عبدالبر ١٤٣/١ ، مصطفى بن أحمد العلوي , محمد عبد الكبير البكري ، الناشر: وزارة عموم الأوقاف والشؤون الإسلامية – المغرب- ، عام النشر: ١٣٨٧ هـ.

١٦. تهذيب اللغة للأزهري ١٦٠/٧ ، ت: محمد عوض مرعب ، دار إحياء التراث العربي – بيروت- ط: الأولى، ٢٠٠١م ،

١٧. تيسير التحرير لأمير بادشاه الحنفي ٣٠٦/٣ ، دار الفكر-بيروت- .

١٨. الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ٢٨٥/٦ ، ت:أحمد البردوني وإبراهيم أطفيش ، الناشر: دار الكتب المصرية – القاهرة ، الطبعة: الثانية، ١٣٨٤هـ

١٩. الجراثيم لابن قتيبة ١٠٧/٢ ، محمد جاسم الحميدي ، قدم له: الدكتور مسعود بوبو ، الناشر: وزارة الثقافة، دمشق. والعين للخليل ١٤٥/٣ ،

٢٠. جمهرة اللغة لابن دريد٥٩١/١ ، ت: رمزي منير بعلبكي ، الناشر: دار العلم للملايين – بيروت ، ط: الأولى، ١٩٨٧م.

٢١. الجنى الداني في حروف المعاني لبدر الدين المرادي المالكي ، ص:٣٤٦ ، ت: د فخر الدين قباوة -الأستاذ محمد نديم فاضل ، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان- ، الطبعة: الأولى، ١٤١٣ هـ.

٢٢. دلائل الإعجاز للجرجاني ، ص:٧٠ ، تحقيق: محمود شاكر ، مطبعة المدني بالقاهرة - دار المدني بجدة ، الطبعة: الثالثة ١٤١٣هـ.

٢٣. الذخيرة للقرافي ١١٣/٤ ، دار الغرب الإسلامي- بيروت - الطبعة: الأولى، ١٩٩٤ م. البيان للعمراني ٥١٩/١٢ ،ت: قاسم محمد النوري،الناشر: دار المنهاج – جدة- ،الطبعة: الأولى، ١٤٢١ هـ.

٢٤. ربيع الأبرار للزمخشري ٣٩/٢ ، مؤسسة الأعلمي، بيروت ، الطبعة: الأولى، ١٤١٢ هـ.

٢٥. ربيع الأبرار للزمخشري ٢٦/٥ ، نهاية الأرب في فنون الأدب لشهاب الدين النويري ٨٩/٤ ، دار الكتب والوثائق القومية، القاهرة،الطبعة: الأولى، ١٤٢٣ هـ.

٢٦. الرسائل ١للجاحظ ، تحقيق: عبد السلام محمد هارون ، مكتبة الخانجي، القاهرة ،١٣٨٤ هـ.

٢٧. رواه ابن ماجة٢/١١٢٠ ، برقم: ٣٣٧٥ ، ت: محمد فؤاد عبد الباقي ، الناشر: دار إحياء الكتب العربية - فيصل عيسى البابي الحلبي
٢٨. روضة الطالبين للنووي ٦٤/١٠ ، تحقيق: زهير الشاويش ،الناشر: المكتب الإسلامي، بيروت- دمشق- عمان- ، الطبعة: الثالثة، ١٤١٢هـ.
٢٩. الزاهر في معاني كلمات الناس لابن الأنباري ٢٤/٢ ، ت: د. حاتم صالح الضامن ، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت- ، الطبعة: الأولى، ١٤١٢ هـ. وتهذيب اللغة للأزهري .
٣٠. الزاهر لابن الأنباري ٤٣٥/١ ، ت: د. حاتم صالح الضامن ، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت ، ط: الأولى، ١٤١٢ هـ.
٣١. سنن أبو داود ٣٢٦/٣ ، برقم: ٣٦٧٤ ، ت:محمد محيي الدين عبد الحميد ، الناشر: المكتبة العصرية، صيدا – بيروت- .
٣٢. سنن النسائي ، ت: عبد الفتاح أبي غدة ، الناشر: مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب- ، الطبعة: الثانية، ١٤٠٦.
٣٣. الشرح الكبير لابن قدامة ٣٢٨/١٠ ، دار الكتاب العربي للنشر والتوزيع ، أشرف على طباعته: محمد رشييد رضا
٣٤. شرح الكوكب المنير لابن نجار الحنبلي ، ت: محمد الزحيلي ونزيه حماد ، مكتبة العبيكان ، ط: الثانية ١٤١٨هـ .
٣٥. شرح شواهد المغني ٩٤٠/٢ ، وقف على طبعه وعلق حواشيه: أحمد ظافر كوجان ، مذيل وتعليقات: الشيخ محمد محمود ابن التلاميد التركزي الشنقيطي ، الناشر: لجنة التراث العربي ، الطبعة: بدون، ١٣٨٦ هـ.
٣٦. شرح مفصل الزمخشري لابن يعيش ٢٧٥/٤ ، ت: الدكتور إميل بديع يعقوب ، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان- ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢ هـ.
٣٧. الشعر والشعراء لابن قتيبة الدينوري ١٥٠/١ ، الناشر: دار الحديث، القاهرة ، عام النشر: ١٤٢٣ هـ ،
٣٨. الشفا بتعريف حقوق المصطفى للقاضي عياض ٦١١/٢-٦١٢،دار الفيحاء – عمان-، الطبعة: الثانية - ١٤٠٧ هـ.
٣٩. الصحاح للجوهري ٦٤٩/٢ ، ت: أحمد عبد الغفور عطار ، دار العلم للملايين – بيروت- ط: الرابعة ١٤٠٧

٤٠. العقد الفريد لابن عبد ربه ٢٢٦/٢ ، دار الكتب العلمية – بيروت ، الطبعة: الأولى، ١٤٠٤ هـ.
٤١. عيون الأخبار له ٤٦٤/١ ، دار الكتب العلمية –بيروت ، تاريخ النشر: ١٤١٨ هـ ، عيار الشعر لأبي الحسن العلوي ، ص: ١٣٩ ، ت: عبد العزيز بن ناصر المانع ، الناشر: مكتبة الخانجي – القاهرة- ،
٤٢. غمز العيون البصائر لأبي العباس الحموي الحنفي٣١٤/٢ ، دار الكتب العلمية ، ط: الأولى، ١٤٠٥هـ
٤٣. فتح الباري لابن حجر العسقلاني ٨٠/١٠ ، الناشر: دار المعرفة - بيروت، ١٣٧٩هـ.
٤٤. فتح القدير لابن همام الحنفي٣٤٨/٤ ، دار الفكر ، الطبعة: بدون طبعة وبدون تاريخ.
٤٥. فتح المغيث للسخاوي ٢٥٣/٣ ، ت: علي حسين علي ، الناشر: مكتبة السنة – مصر- ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٤هـ.
٤٦. الفروق للقرافي ١٤٦/٤
٤٧. الفصول للجصاص ١٦٢/٢ ، ط: وزارة الأوقاف الكويتية ، الطبعة الثانية، ١٤١٤هـ.
٤٨. فقه اللغة للثعالبي ، ص:١٨٦ ، ت:عبد الرزاق المهدي ، الناشر: إحياء التراث العربي ، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤٢٢هـ.
٤٩. الكشاف لجار الله الزمخشري ، الناشر: دار الكتاب العربي – بيروت- ، الطبعة: الثالثة - ١٤٠٧ هـ
٥٠. كشف الأسرار شرح أصول البزدوي ١١٤/١ ، دار الكتاب الإسلامي ، الطبعة: بدون طبعة وبدون تاريخ.
٥١. لمحلّى لابن حزم ١٧٦/٦ ، دار الفكر –لبنان-
٥٢. متن الجوهر المكنون في المعاني والبديع والبيان ، للعلامة الأخضري
٥٣. المجموع شرح المهذّب للنووي ١١٢/٢٠ ، دار الفكر بيروت –لبنان- .
٥٤. محاضرة الأدباء للراغب ٧٧٧/١ ، شركة دار الأرقم بن أبي الأرقم – بيروت- ، الطبعة: الأولى، ١٤٢٠ هـ. ،
٥٥. المحصول للرازي ٢٨/٢ ، ت: الدكتور طه جابر فياض العلواني ، الناشر: مؤسسة الرسالة، الطبعة: الثالثة، ١٤١٨ هـ. و
٥٦. المدوّنة للإمام مالك ٥٢٣/٤ ، الناشر: دار الكتب العلمية،الطبعة: الأولى، ١٤١٥هـ.

٥٧. المذكرة للشنقيطي ، ص:٥٠ ، مكتبة العلوم والحكم، المدينة المنورة ، الطبعة: الخامسة، ٢٠٠١ م.

٥٨. المستصفى للغزالي ، ص:٣٢١ ، محمد عبد السلام عبد الشافي ، دار الكتب العلمية ، ط: الأولى ١٤١٣هـ.

٥٩. المستطرف في كل فن مستطرف لأبي الفتح الأبشيهي ، ص:٢٣ ، عالم الكتب – بيروت- الطبعة: الأولى، ١٤١٩ هـ.

٦٠. المسند للامام أحمد ، ت: شعيب الأرنؤوط - عادل مرشد، وآخرون، إشراف: د عبد الله بن عبد المحسن التركي، الناشر: مؤسسة الرسالة، الطبعة: الأولى، ١٤٢١ هـ.

٦١. معالم السنن للخطابي ٢٢٣/٤ ، المطبعة العلمية – حلب ،الطبعة: الأولى ١٣٥١ هـ.

٦٢. معترك الأقران للسيوطي ٢١٤/١ ، دار الكتب العلمية - بيروت – لبنان - الطبعة: الأولى ١٤٠٨ هـ .

٦٣. المعتمد لأبي الحسين البصري ٥٨/١ ، ت: خليل الميس ، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت- الطبعة: الأولى، ١٤٠٣هـ,

٦٤. معجم مقاييس اللغة للأزهري ٢١٥/٢ ، ت: عبد السلام محمد هارون ، الناشر: دار الفكر ، ١٣٩٩هـ

٦٥. مغني اللبيب لابن هشام ، ص:٦٢٩ ، ت: د. مازن المبارك / محمد علي حمد الله ، الناشر: دار الفكر – دمشق ، الطبعة: السادسة، ١٩٨٥.

٦٦. مفتاح العلوم للسكاكي ص: ٢٨٦ ، ضبط و تحقيق: نعيم زرزور، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان- ، الثانية، ١٤٠٧ هـ.

٦٧. المنثور للزركشي ٣١٧/٢ ، ط: وزارة الأوقاف الكويتية، الطبعة الثانية، ١٤٠٥هـ.

٦٨. الموافقات للشاطبي ٩٩/٥ ، ت:أبي عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان ، الناشر: دار ابن عفان ، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤١٧هـ.

٦٩. نقد الشعر لقدامة بن جعفر ، ص:٢١ ، مطبعة الجوائب – قسطنطينية- ، الطبعة: الأولى، ١٣٠٢هـ ،

٧٠. نيل الأوطار للشوكاني ٧٠/١ ، ت: عصام الدين الصبابطي ، الناشر: دار الحديث، مصر ، الطبعة: الأولى، ١٤١٣هـ.

٧١. والإتقان للسيوطي ١٥٧/٣ ، ت: محمد أبو الفضل إبراهيم، الناشر: الهيئة المصرية العامة للكتاب،الطبعة: ١٣٩٤هـ.

٧٢. والأشباه والنظائر للسبكي ٤٥/١ ، دار الكتب العلمية ، الطبعة: الأولى ١٤١١هـ .

٧٣. والبيهقي في الكبرى ٥٣٤/٥ ، برقم: ١٠٧٧٨ ، ت: محمد عبد القادر عطا ، الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنات– الطبعة: الثالثة، ١٤٢٤ هـ.

٧٤. الوسيط في تراجم أدباء شنقيط لأحمد بن الأمين الشّنْقِيطي ، ص:٥٥٣ ، الناشر: الشركة الدولية للطباعة – مصر– ، الطبعة: الخامسة، ١٤٢٢ هـ.